



## ناسنامەی کتێب


ناو: بۆ ئەوەی بەختەوەرترین کەس بیت

بابەت: ئایینی

نووسەر: عائض القرني

وەرگێڕ: زیوەر ئەنوەر

چاپخانە: نوسینگەی هیوا

چاپ: سێیەم چاپ/ ٢٠١٤

بەرهەم: (٢٩)






لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٧٢٩)ی ساڵی (٢٠٠٧)ی پێدراوە.





07504671394

hawler.chap@gmail.com



www.iqra.ahlamontada.com

# بۆ ئەوەی
# بەختەوەرترین کەس بیت

نووسینی: عائض القرني
و: زێوەر ئەنوەر

چاپی سێیەم
٢٠١٤/ هەولێر

www.iqra.ahlamontada.com

## بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبان

سوپاس و ستایش بۆخودای مەزن، درودو سلاو لەسەر پێغەمبەری خوداو هاوەلانی،

چەندین کتێبم لەم کتێبەدا، پوخت کردۆتەوە، بۆئەوەی ئاسان بێت و بەردەوام داوا لە خۆت بکەی بۆجێ بە جێ کردنی، لەسەر چەند بنچینەیەك دامڕشتووە، ناوم لێنا (بۆ ئەوەی بەختەوەرترین کەس بیت) زۆربەم لەکتێبی (دلتەنگ مەبە)، هەروەها لەدەیان کتێبی تر وەرگرتووە، ئەوانەی باسی کامەرانی دەکەن،داواکارم لەخودای پەروەردگار بۆخۆم و بۆ تۆ، لەدنیاو لەقیامەت دلشادو کامەرانمان بکات، بەردەوام لەکارەکانمان سەرکەوتووبین لەگەل رێزمدا،

عائض القرني

١٤٢١/٢/٤ ك



منتدى اقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com

# بۆ ئەوەی بەختەوەرترین کەس بیت



- بـاوەڕ، خـەم و خەفـەت لادەبـا، ڕوونـاکی چـاوو سـێبووری خواپەرستانە.
- ئەوەی ڕۆیی، بیری لێ مەکەرەوە،
- بەقەزاو قەدەرو ڕۆزییەکەت ڕازی بە
- بێزاری دەر مەبڕە، هەمووی دانراوە،
- بەیادی خـودا گونـاه دەوەر، دڵ ئـارام دەبـێ، خـەم و خەفـەت لا دەچێ، خوداش پێی خۆشە.
- چـاوەڕێی سـوپاس لەکـەس مەکـە، پاداشـتی خـودا بەسـە، گـوێ مـەدە بـەو کەسـانەی بەرامبـەر تـۆ سـپڵەنە، یـا ڕق و قینـەو ئیرەییت پێ دەبەن.
- گەیشتیە بەیانی، چاوەڕێی ئێـوارە مەکـە، تـەنیا بـەگوێرەی ئـەم ڕۆژە کارو بارت چاك و ڕێك و پێك بکەو بژیێ،
- پەلەمەکـە دوا ڕۆژ خـۆی دێـت، لەسـبەی مەترسـە، چـونکە کـە ئەمڕۆت چاك کرد، بەیانیت چاکە.
- دڵت لەئیرەیی، ڕق، بوغزو قین، بەربەرەکانێ، خاوێن بکەوە.



www.iqra.ahlamontada.com

- ئەم بوونەوەرە لەسەر پەیڕەوو نیزام بنیات نـراوە، کەواتـە جـل و بەرگ و ماڵ و دووکان و شوێنی کارت ڕێك و پێك بکە،
- بــڕۆ دەشــت و دەر، تەمەشــای باخچــەی جــوان و ئەفرانــدن و دروستکرا وەکانی خودا بکە.
- وەرزش بکە، بەپێ هاتوچۆ بکە، تەمبەڵی مەکە، لەدەست بەتاڵی و بێ ئیشی دوور بە،
- مێــژوو بخوێنــەوە، بــیر لەبەســەر هــات و ڕووداو و چــیرۆکە ناوازەکان بکەرەوە.
- ژیانـت بـەردەوام تازەبکـەوە، شـێوازی ژیانـت جـۆراو جـۆر بکـە، هەمان هەلسو کەوتی دووبارەی ڕۆژانەت بگۆڕە،
- چـایەو قـاوە، یـا مـەیخۆرەوە یـا کـەم بیخـۆرەوە، نەکـەی نـزیکـی جگەرەو نێرگەلەو،............ببیتەوە،
- بایـەخ بـە خـاوێنی پۆشـاك و ڕێکیـت بـدە، بۆنـت خـۆش بکـە سیواك بەکار بهێنە،
- ئـەو کتێبانـەی مـرۆڤ فێـری نائومێـدی، بـێ هیـوایی، داتـەپین دەکەن مەخوێنەوە.
- چاك بزانـە، خـودا لێبوردەیـە، تۆبـە قبـوڵ دەکـا، لەبەنـدەکانی خۆش دەبێت، خراپە دەگۆڕی بۆچاکە،
- لەسـەر ئـاین، ئـەقڵ، تەندروسـتی، بـوونی پـەناو داڵـدە، توانـای



www.iqra.ahlamontada.com

بیستن، بینین، ڕۆژی، مندالٚ،........هتد، سوپاسی خودابکە،

- نازانی خەلك هەیە، ئەقلٚی نەماوە، نەخۆشە، بەند کراوە، کەم ئەندامە، ئیفلیجە، یاتووشی کارەسات بووە ؟أ.
- لەگەلٚ قورئان بژییٚ، بە بیستن، بە خویٚندنەوە، بە ئەزبەرکردن، چونکە بۆلابردنی خەم و خەفەت، گەورەترین چارە سەرە،
- پشت بە خودا ببەستەو کارو بارتی پیٚ بسپیٚرە، بە قەزاو قەدەری خودا ڕازی بە، ئەو پەنای تۆیە، تەنیا ئەوت هەبیٚ بەسە،
- لەو کەسەی خۆش بە ستەمی لیٚکردووی، ئەوەی سەردانت ناکا تۆسەر دانی بکە، بەخشش بدە بەوکەسەی نایدا بە تۆ، نەرم و نیان بەلەگەلٚ ئەو کەسەی ئازاری دای، بە دلٚخۆشی و ئاسوودەیی دەژی.
- زۆر (**لا حول ولا قوه الا بالله**) بلٚیٚ، دەروونت ئارام دەبیٚ، گوزەرانت باش دەبیٚت، بۆ نەهامەتیەکانی ژیان توانا بەخشە، خوداش پیٚی خۆشە،
- لە دلٚەوە زۆر داوای لیٚ خۆش بوون بکە، ڕۆژی، ڕزگاری، وەچەو مندالٚ، زانستی بەسوودە، کار ئاسانی، وەرینی گوناهی لەگەلٚە.
- بە ڕوخسارو شیٚوەو تواناو پارەو کەسو کارو مالٚت ڕازی بە، دلٚت


www.iqra.ahlamontada.com

خۆش و دەروونت ئارام دەبێت،

- بزانە لەگەڵ ناخۆشی و خەم، دەرووش دەکرێتەوە، بەردەوامی بۆهیچ شتێك نیە، ڕۆژگاریش لەخولانەوەیە.
- ئومێدت زۆر هەبێت، بێ هیوا مەبە، بیری چاکەت لەخوداوە بۆخۆت هەبێت، بەردەوام چاوەڕێی شتی باش و جوان بکە،
- بە تەقسیمی خودا ڕازی بە، دڵخۆش بە، چونکە نازانی بەرژەوەندیت لەچی دایە ڕەنگە کەم دەستیت خێری بۆتۆ هەبێت،
- کارەسات و نەهامەتی، بەهۆی پاڕانەوەت لەخودا نزیکت دەکاتەوە چونکە لوتبەرزیی و ڕالە خۆبوون لەسەر خەڵکیو فیز لێدان ناهێڵێ،
- هەزاران بەخششی خودا لەلەشی خۆتدا هەیە، خودا پێشکەشی کردووی،
- چاکە لەگەڵ خەڵك بکە بەسەردانی نەخۆش، یارمەتی هەژار، بەزەیی بەهەتیو، دڵت خۆش دەبێت،
- دووربە لەگومانی خراپە خەیاڵی نەخۆش، بیرۆکەی خراپ،
- وانەزانی، تەنیا تۆ کارە ساتت بەسەر هاتووە، کەس نیە تووشی خەم و تەنگانە نەبووبێت،
- چاك بزانە دونیا شوێنی تەڵەزگەو گێچەڵ و ناخۆشی و خەمە،



www.iqra.ahlamontada.com

ڕازی بە، پشت بە خوا ببەستە،

- بیر لەوانـەی پـێش خـۆت، (لـەکار دەرکـران، بەنـد کـران، تـالآن کران، کوژران، تووشی مەینەتی و کارەسات). بوون، بکەوە،
- خەم و خەفەت، برسیەتی، هەژاری، نەخۆشـی، قـەرز، کارەسـات، لێ قەو مان، لای خودا پاداشتی هەیە،
- باش بزانە، تەنـگ و چەڵەمە، بیرو هۆشی مـرۆڤ دەکاتـەوە، دڵـی هۆشیار دەکات مرۆڤ لەتاوان دەگێڕێتەوە، خێرو چاکەی بۆزیـاد دەکات.
- چاوەڕێی کارەسات و ڕووداو مەکە، بەگۆتە گۆت خـۆت خـەریك مەکە، باوەڕ بە پڕوپاگەندەش مەکە،
- لەوانەیــە زۆربــەی ئــەو شــتانەی لێــی ئەترســین، ســەرەنجام وانـەبێت، نیگـەران مەبـە، لەلایـەن خـودا، چـاودێری، یارمـەتی هەیە، خودا بەسە بۆ مرۆڤ،
- لەگــەڵ پیــاوی ئــیرە بــەر، ئێســك گــران، خــاوەن ڕق و کینــە، دامەنیشە، هەرئەوانە سەرچاوەی نەخۆشـینە بـۆ ڕۆحـی مـرۆڤ، هەروەها پەیامنێری دڵتەنگی و ناخۆشی،
- بـەردەوام (اللـه اکـبر) ی نوێـژ دابەسـتن، بـە کۆمـەڵ بکـە، لـە مزگەوت زۆر بمێنەوە، خۆت ڕابێنە بە تالوکە کردن ئەو کاتـەی نوێژ کاتی دێت، دڵت خۆش دەبێت،



www.iqra.ahlamontada.com

- لەگوناه دوورکەوە، سەرچاوەی خەم و خەفەت و لێ قەومان و کارەسات و نەهامەتی یە،
- بەردەوام بڵێ ﴿لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنتُ مِنْ الظَّالِمِينَ﴾ الانبياء:٨٧.
- بۆ لابردنی ناخۆشی و خەم و خەفەت، نهێنیەکی سەر سوڕهێنی تێدایە،
- با قسەی ناشیرین و جنێوی کەس، کارت تێ نەکات، کەسەکە خۆی ئازار دەچێژێ نەك تۆ،
- بە جنێوی دووژمنەکان و خراپ بێژی حەسوودەکانت، نرخ و پلەو پایەت دەزانرێ، چونکە بویتە پیاوێکی ناودارو گرینگ،
- ئەوکەسەی پاش ملە باسی کردی، خێرو چاکەکانی خۆی پێشکەش کردی، گوناهەکانی هەڵوەراندی، بەناوبانگی کردی ئەمانەش بەخششی خودایە.
- هەروەکو چۆن لەسونەت هاتووە، بۆخودا پەرستی زۆر، ئەرك و پاڵە پەستۆی زیاد مەخەرە سەر خۆت، باکەم و پوخت، مامناوەندی، بێ زیادە ڕۆیی بیت.
- چەند دڵسۆز بیت بۆ خودا، ئەوەندە دڵت و خۆش و ئاسوودە دەبێت،
- ئازا، دڵ دامەزراو، خاوەن دەروونی بەرز، گەردەلوول و



www.iqra.ahlamontada.com

پڕوپاگەندە، کاری تێ ناکات،

- بەردەوام چاکە بکە، بەخشندە دڵی خۆشە، دەروونی ئاسوودەیە، بەڵام ڕەزیل و پیسکە دڵتەنگ و دەروون تاریکە،
- لەگەڵ خەڵك ڕووت خۆش بێت، بەنەرمی گفتو گۆیان لەگەڵ بکە، تۆیان خۆش دەوێت، ڕێزیان بگرە، ڕێزت دەگرن.
- بەنەرمی و باشترین شێوە ڕەفتار لەگەڵ خەڵك بکە، مەهێڵەکەس ببێتە دوژمنت، زوو ئاشتیان بکەوە، هاوڕێ زۆر پەیدابکە.
- ئومێدو سەرچاوەی بەختەوەرەو کامەرانی، دوعای دایك و باوکە، بەدەرفەتی بزانە، بۆئەوەی بەرامبەر گشت ناخۆشیەك ببێتە پەرژێنێکی پتەو.
- هەڵسوکەوتی سروشتی خەڵك قبوڵ بکە، لێیان ببوورەو لە هەڵەکانیان خۆش بە، مرۆڤ بەم شێوەیە لەژیاندا دروست کراوە.
- لەخەیاڵ، مەژی بەڵکو لەبنچینە ژیان چۆنە وابژی، داوای کارێك لەخەڵك مەکە، بەخۆت ناکرێ، داد پەروەربە،
- نەکەی زیادە ڕەوی بکەی، سادە بژی، لەئاستی خۆت زیاتر پارە سەرف مەکە، ڕۆحت ئالۆزو پەرێشان دەبێت،
- ئاگاداری ویردی بۆنەکان بە، چونکە سەرتاپای ئەوڕۆژە



www.iqra.ahlamontada.com

دەتپارێزێ، ڕێنمایی و پشتیوانە.

- کارەکانت هەمووی لەیەك کات مەکە، دابەشی بکە، لەنێوانیان پشووبدە،
- لەوانەی بە ڕوخسارو شێوەو لەش لە تۆجوانترن، بەسامان و پارە لەتۆدەوڵەمەند ترن، بەفەرمان و پلەو پایە بەرزترن، منداڵی زۆر یان هەیە، تەماشای خوارەوەی خۆت بکە، تابزانی تۆلەسەرەوەی هەزاران هەزار کەسی،
- باوەڕبکە، برا، کوڕ، هاوسەر، خزم، هاوڕێ، بێ کەم و کوڕی نین، خۆت لەسەر ئەمە ڕابێنە. – ئەو پیشە زانییەی خوا داویەتی بیگرە وازی لێ مەهێنە، ئەوزانستەی حەزت لێ یە بخوێنە، بەو ڕۆزییەی هەنە سوپاسی لەسەر بکە، ئەو کارەی بۆتۆ دەگونجێ بیکە.
- نەکەی دڵی کەس یاکۆمەڵەیەك برەنجێنی، زمان پاراو، قسە خۆش، بێ وەی، نەرم بە،
- پشوو فراوانی خەوش دادەپۆشێ، نەرم ڕەفتار گوناه دادەپۆشێ، بەخشین کراسێکی گەورەیە کەم و کوڕی دەپۆشی.
- کاتژمێرێك بۆبیرکردنەوە لەخۆت و لە کاروباری ژیانی دونیاو ڕۆژی دوای تەرخان بکە.
- کتێبخانەکەت باخچەیەکی سەوزە، پڕلە گوڵ و گوڵزارە، لەگەڵ


www.iqra.ahlamontada.com

داناو زاناو ئه‌دیب و شاعیر ان، هاتو چۆی تێدابكه‌،

- وریابه‌ ڕۆزی حه‌لاڵ نه‌ك حه‌رام په‌یدا بكه‌،
- لــه‌ داواكــردن له‌خــه‌ڵك دووربكــه‌وه‌، بازرگــانی باشــتره‌ له‌فه‌رمانبــه‌ری، بــه‌و پــاره‌ی هــه‌یتت، مامه‌ڵــه‌ی پــێ بكــه‌، بــه‌ میانڕه‌وی بژی.
- له‌جلو به‌رگ مام ناوه‌ندی به‌، نه‌ هـی هـه‌ژار، نـه‌هی ده‌وڵه‌مه‌نـد مه‌پۆشــه‌، جلـی وامه‌پۆشـه‌ لـه‌ناو خـه‌ڵك ده‌ربكـه‌وی یـا خـۆت ده‌ربخه‌ی، به‌ڵكو وه‌كو گشت خه‌ڵك به‌،
- تووڕه‌مه‌بــه‌، دڵ تونــدو په‌رێشــانت ده‌كــا، هــاوڕێ بــوون، خۆشه‌ویستیت، په‌یوه‌ندیه‌كانت تێك ده‌دا،
- جار به‌جار گه‌شت بكه‌، تا شوێن و شارو وڵاتان ببینی، گه‌شـت و گوزار ژیان نوێ ده‌كاته‌وه‌، دڵ خۆش ده‌كا،
- ده‌فتــه‌رێكی یاداشــتی بچـوك لــه‌گیرفانت دابــنێ، تاكــارو بــارو كاته‌كان و گفت و به‌ڵێنه‌كان و تێبینیه‌كانت تێدا تۆمار بكه‌ی.
- له‌سڵاو كردن به‌ڕوویه‌كی خۆش ده‌ستپێشخه‌ربه‌، بایه‌خ به‌خه‌ڵك بده‌، تاله‌ دڵیان نزیك بیت و تۆیان خۆش بوێت،
- پشت به‌خۆت ببه‌سـته‌ نـه‌ك به‌خـه‌ڵك، وابزانـه‌ له‌به‌رامبه‌رتـدان نـه‌ك له‌گه‌ڵت، بـه‌ڵكو تـه‌نیا خـوات له‌گه‌ڵه‌، بـه‌هاوڕێی خـواردن وهه‌بوون ده‌ستخه‌ڕۆمه‌به‌،



www.iqra.ahlamontada.com

- وریابە لەوشەی (دواتر، پاشان)دەیکەم، دووربکەوە لەدواخستنی کارو فەرمان چونکە ئەمە سەرەتای ژێرکەوتن و بەزینە،
- لەبڕیاردان سێ و دوومەکە، دامەمێنێ، دوودڵ مەبە، بەڵکو لەکاتی پێویست، یەکسەر بڕیاربدەو برۆ پێش و کارەکە ئەنجام بدە،
- بەگۆڕینی کارو پیشە تەمەنت بەفیڕۆمەدە، ئەمە مانای وایە، لەهیچیان سەرناکەوی،
- بەتاوان سڕینەوەی بەڵاو کارەسات، هەروەها کاری چاکە، تەوبەو پەشیمانی، دوعای موسڵمانان، بەزەیی پەروەردگار، شەفاعەتی پێغەمبەر(د.خ)دڵت خۆش بێت.
- خێرو چاکە بکە، باکەمیش بێت، گوناه دەکوژێنێتەوە، دڵ خۆش دەکا، خەم ڕەوێنە، ڕۆزیش زیاد دەکات،
- موحەمەد(د.خ)بکە پێشەوای خۆت، چونکە بۆبەختەوەری، بۆژیانی کامەرانی، بۆسەرکەوتنت دەبات،
- -لەبەرەوەی ئاگات لەو هەموو بەهرەو چاکە نیە خودا پێی بەخشیویت، سەردانی نەخۆشخانە بکە تاشوکری ئەو لەش ساغیەت بکەی، سەردانی بەندیخانە بکە تا سوپاس گوزاری ئەو ئازادییەت بکەی، سەردانی شێتخانەو نەخۆشخانەی دەروونی بکە تا سوپاسی ئەوئەقڵەت بکەی.



www.iqra.ahlamontada.com

- وریابە پرسیێکی سادە، گەورە مەکە، نەتڕووخێنی، زیادەڕەوی لێ مەکە.
- ئاسۆی بیرکردنەوەت فراوان بکە، بیانو بۆئەو کەسانەی ئازاریان دای بدۆزەوە، نەکەی هەوڵی تۆڵەسەندنەوە بدەی تا بەئاسوودەیی بژی،
- بە توڕەبوون و خەم خواردن دوژمنت خۆش مەکە، ئەوەیان مەبەستە، هیواکانیان جێ بەجێ مەکە بەتاڵکردنی ژیانی خۆت.
- بە دوژمنداری کین و قینەو ڕق لەخەڵکی، لەدەروونتدا کوورە دامەگیرسێنە، چونکە ئازارێکی بەردەوامە،
- لەکاتی دانیشتنەکانت، بەڕێز، ڕووخۆش، ڕێزلێنەر، بێ پچڕاندنی قسە، گوێ بیست بۆخەڵك، کەمدوو تەنیا لەقسەی خێر نەبێت.
- وەکو مێش مەبە، تەنیا لەسەر برین دەنیشێ، نەکەی باسی ئابڕوو و کەموکوڕی خەڵك بکەی، بەکەوتنی خەڵك دڵخۆش نەبی، بەدوای هەڵەو خلیسکانیان مەگەڕێ،
- خاوەن باوەڕ خەم لەدەست چوونی دنیا ناخوات، گرنگی پێ نادات، لەکارەساتەکانی ناترسی، چونکە هیچ نییە، بێ نرخە، نامێنێتەوە.


www.iqra.ahlamontada.com

- بەهیچ شێوەیەك تخونی دڵداری، حەزلێ کردن، خۆشەویستی نابەجێ مەکەوە، چونکە بۆڕوح دەردو ئازارە، بۆدڵ نەخۆشیە، بەرەو یادو گوێڕایەڵی خودا ڕابکە.
- تەمەشای شتی ناڕەواو حەرام مەکە، خەم و خەفەتە، دڵ بریندار دەکا، مرۆڤی بەختەوەر لەم شتانە چاوی دەپۆشی.
- خواردنی بەسوود، لەکاتی خۆی، جەمی خۆراکت بخۆ، زیاد لەتێربوون مەخۆ، دوای نانخواردنیش یەکسەر مەخەوە،
- لەکاتی هەر ڕووداوێکدا، خراپترین شێوە مەزەندە بکە، خۆت ڕابێنە، بەڕازی بوون، هەست بەئارام بوونەوەوئاسان بوونی دەکەی،
- پەت چەند ئەستووربێت، هەردەپسێ، دوای شەو خۆردەردەکەوێ، دوای تەنگی فراوانی دێت، یەك تەنگانە بەسەر دووئاسان کاری زاڵ نابێت ﴿فَإِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا * إِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا﴾ الشرح/٥ – ٦.
- بیرلە بەزەیی خودا بکەوە، لەو تاوانبارە خۆشبوو کە ئاوی دا سەگێکی تێنوو، لەو کەسەی سەت کەسی کوشتبوو، خۆش بوو، داوای تەوبەی لە(نصاری) کردووە.
- بنچینەی نەگۆڕ، دوای برسیەتی تێرییە، دوای تێنوویەتی تێر ئاو خواردنەوەیە، دوای نەخۆشی لەش ساغیە، دوای هەژاری


www.iqra.ahlamontada.com

دەوڵەمەندییە، دوای خەم و خەفەت کەیف خۆشییە.

- سەرنج بدە سورەتی(الم نشرح لك صدرك)، بیری لێ بکەوە، زۆر چاك بزانە لەکاتی تەنگانە چاکترین دەرمانە،
- لەکاتی ترس و لێ قەومان ئەم دوعایەبکە (لاالە الا الله العظیم الحلیم، لا الە الاالله رب العرش العظیم، لاالە الا الله رب السموات ورب العرش الکریم)رواە البخاری و مسلم،
- کاتی تووڕەیی بێ دەنگ بە، لەدژی شەیتان، پشت بەخوا ببەستە، شوێن بگۆڕە، ئەگەر بەپێوە وەستابووی دانیشە، یادی خوازۆر بکە.
- لەناخۆشی مەترسە، دڵت بەهێزدەکا، نرخی لەش ساغی و تەندروستی دەزانی، بۆدەروون توانا بەخشە،، پلەو پایەت بەرزدەکا، سەبرت بەدەردەیەخێ.
- بیر لەڕابردوو گەوجی و شێتیە، وەکو ئارد ببەیتە ئاش، شەنە بای بەئاردەداربکەی، مردوو لەگۆڕ دەربهێنی وایە،
- لەلایەنە باشەکەی کارەسات بنواڕە، بیرلەخێرەکەی بکەوە بزانە لەوەش خراپتر هەیە، تەمەشای لێ قەوماوان بکە.
- ئەوەی بەسەرت هات، دەبوایە هەروابێ، ئەوەی بۆتۆ دانەنرابێت هەرگیز نابێت، مەرەکەبەکە وشك بۆتەوە، لەگەڵ قەزاو قەدەری خودا هیچ ناکرێ،



www.iqra.ahlamontada.com

- هەوڵ بدە زیان بکەیتە قازانج، لەلیمۆی ترش شەربەتی شیرین دروست بکە، کەمێك شەکر لەئاوی کارەسات بکە،، لەگەڵ ژیانت خۆت بگونجێنە.
- هەرگیز لەبەزەیی ویارمەتی خودا نائومێد مەبە، بەگوێرەی توێشوو یارمەتیت بۆدێت.
- تۆنازانی، زۆربەی چاکەو خێر لەگەڵ ئەو شتانەیە، ڕقت لێ یەتی، چەندین خێرو خۆشی لەناو ناخۆشیەکان خۆی مەڵاس داوە.
- بیرو ئەندێشەت، تانەت باتە نێو ئاقاری خەم و خەفەت لەچوار چێوەیەك دابنێ، بیرلەبەخششەکانی خودا، تایبەت بەخۆت بکەوە.
- دووربە لەهەراو دەنگە دەنگ لەماڵەوەو شوێنی کارت، لەنیشانەکانی بەختەوەری و کامەرانی، بێ دەنگی، کش و ماتی، ئارامی، ڕێك و پێکییە.
- بۆتەنگانە نوێژ باشترین چارەسەرە، روح و دەروونی مرۆڤ بۆبەرزایی نوورو سەرکەوتن و ڕزگاربوون دەبا،
- کاری چاك، مرۆڤ لەبیری خراپ، لێکدانەوەی هەڵە، بۆچوونی حەرام دووردەکاتەوە.
- باوەڕهێنان بەخوداو ڕۆژی دوایی، خۆراك و ئاو هەواو ڕووناکی



www.iqra.ahlamontada.com

درەختی بەختەوەریە،

- خاوەن ڕەوشت و ئەدەب و هەڵسوکەوتی جوان، دڵی خۆی و خەڵکی کامەران دەکات، دەروونی ئاسوودەو گوزەرانی باش دەبێت.
- جار بەجار پشوو بدە، دڵ ماندوو و بێزار دەبێ، شێوازەکانی ژیانت بگۆڕە، قسەی پەند ئامێزو زانیاری هەمە چەشنی بۆ ئامادە بکە.
- زانست دڵ خۆش دەکا، بیرو لێکدانەوەفراوان دەکا، بۆدەروون ئاسۆ والا دەکا، لەخەم و خەفەت ڕزگاری دەکا.
- زاڵبوون بەسەر کۆسپ و تەنگو چەڵەمە، خۆشبەختیە، هیچ خۆشیەك ناگاتە خۆشی سەرکەوتن و بردنەوە.
- ئەگەر دەتەوێت لەگەڵ خەڵك بەخۆشی بژیت، چۆن دەتەوێ خەڵك هەلسوکەوتت لەگەڵ بکەن، تۆش وا هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکە، کەلو پەلیان بەنرخی کەم هەڵمە سەنگێنە، ڕێزیان کەم مەکەرەوە،
- مرۆڤ ئەگەر خۆی ناسی، کاری بەوزانینەی خۆی کرد، تامی سەرکەوتن دەچێژێ،
- زانیاری و تاقی کردنەوەو شارەزایی، گەورەترە لەگەنجینەو سەرمایە، چونکە دڵخۆش بوون بە پارەو سامان بۆڕابواردنە،



www.iqra.ahlamontada.com

بەڵام دڵخۆش بوون بەزانست بۆ مرۆڤایەتیە،

- ئەگەر ژن و مێرد، یەکێکیان توورەبوون، بائەوی تر بێدەنگ بێت، کەس نیە بێ خەوش و کەم و کورِی، کەواتە بایەکتری لەسەر خووەکانیان قبووڵ بکەن.
- هاودەمی چاك و ئومێد بەخش، بە هیوا، کارە سەختەکانت ئاسان دەکا، مرۆڤی بەد بین و بێ ورە، دنیا لەبەر چاو تاریك دەکات،
- ئەوەی هاوسەرو خانوو و تەندروستی باش و برِێك پارەی هەیە، هەموو ژیانی هەیە، با سوپاس گوزارو رِازی بێت، هەرچی دوای ئەمانەیە، خەمە،
- (هەرکامێکتان لەخۆی ئەمین بێ، مەترسی لەگیانی خۆی نەبێ، لەش ساغ بێت، نان و ئاوی ئەو رِۆژەی هەبێت، وەکو هەموو جیهان، بە هەموو خۆشییەکانیەوە هی ئەو بێت وایە)تورمزی گێرِاویەتیەوە.
- لەبنەماکانی رِازی بوون، ئەوەی بەخوایەتی خوداو ئاینی ئیسلام وپێغەمبەرایەتی محمد(د.خ) رِازی بێت، خودا رِازی دەکات،
- بنچینەکانی سەر فرازی، خودا لێت رِازی بێت، خەلکی دەورو بەرو دەروونی خۆشت رِەزابوونی هەبێت، هەروەها بەرهەمی



www.iqra.ahlamontada.com

چاکت هەبێت،

- خواردن دڵخۆشی یەك ڕۆژە، گەشت دڵخۆشی یەك هەفتەیە، ژن هێنان دڵخۆشی یەك مانگە، پارە دڵخۆشی یەك ساڵە، ئیمان و باوەڕ دڵخۆشی هەموو ژیانە،
- بەنووستن و خواردن و خواردنەوەو ژن هێنان، بەختیار نابیت، گەورە پیاوان بەکردەوەی چاك ناویان دەرکردووە،
- ئەوکەسەی کاتی خوێندنەوەی هەبوو کامەرانە، چونکە لەهەموو باخچەکانی جیهان گوڵ دەچنی، سەر سوڕهێنەرەکان دەزانی، کات و شوێن دەبڕی.
- گفتوگۆ لەگەڵ هاوڕێ خەم لابەرە، گاڵتەو قسەی خۆشی لەئازار بەدەر خۆشە، خوێندنەوەو بیستنی هۆنراوە دڵ ئاسوودە دەکا،
- ژیانی بەندە بەتێڕوانینی خۆت، چۆنیەتی بیرکردنەوە ژیانت دروست دەکا، کەواتە چاویلکەی ڕەش لەچاو مەکە.
- یەك چرکەش لەژیانت بەفیڕۆمەدە، بەبیرکردنەوە لەوکەسانەی ڕقت لێیان دەبێتەوە، چونکە ئەوان ئاگایان لەتۆو خەمەکەت نییە، بەڵکو بیرلەو کەسانە بکەوە خۆشیانت دەوێ،
- ئەگەر بەناو کارە بەپیتەکەت ڕۆچووی، ئارام و ئاسوودە دەبیت.
- کامەرانی بەڕەچەڵەك و ڕەگەزو خزمایەتی نییە، بەئاڵتوون و سامان نییە، بەڵکو بەئایین و زانست و ئەدەب و گەیشتن


www.iqra.ahlamontada.com

بەهیواو ئاواتە.

- بەختەوەرترین بەندە لای خودا، ئەوکەسەیە چاکەی زۆر بکا، یارمەتی برایانی بدا، زۆر سوپاسگوزاربێت،
- بەهەوڵ و تەقەڵای خۆت کامەرانیت بەدەست نەهێنا، چاوەڕێی ئاسمان مەکە لەوێدا بێتە خوارەوە،
- بیرلەدەستکەوتەکان و بەرهەمت بکەوە، هەروەها ئەو چاکانەی کردووتە، دڵت پێ خۆش بکە، سوپاسی خودابکە، ئاسوودە دەبیت،
- ئەوەی خەمی دوێنێی لەکۆڵ کردیەوە، خەمی ئەوڕۆو سبەش ناهێڵێ پشتی پێ ببەستە، ئەگەر لەگەڵت بێت لەچی دەترسی، لەگەڵت نەبێت چاوەڕێی کێ دەکەی؟
- نێوان تۆو دەوڵەمەند یەك ڕۆژە، دوێنێ خۆشییەکەی ڕۆیی و نەما، بەیانیش کەس نازانێ، تەنیا ئەمڕۆیە، ئەویش کاتێکی زۆر کەمە !
- شادمانی مرۆڤ گورج و گوڵ، دڵ خۆش دەکا، کۆئەندامی لەش چالاك دەکا، هێزو توانا زیاد دەکا، ژیان نرخدارو تەمەن بە پیت و بەرەکەت دەکا.
- بنچینەکانی بەختەوەری، هەبوون و ژیانی ئارام و تەندروستی باش و ئایینە، بەدبەختیش بۆهەژارو ترسنۆك و نەخۆش و بێ



www.iqra.ahlamontada.com

باوەڕە،

- ئەوکەسەی میانڕەوبێت، بەختەوەر دەبێت و بەئامانج دەگات، ئەوەی لەکارەکانی نەرمی بنوێنێ، ئومێدو مرازی بەدەست دەهێنێ،
- لەکاتەکانی ژیان، تەنیا یەك وشە هەیە، ئەویش ئێستایە، لەفەرهەنگی بەختەوەری تەنیا یەك وشە هەیە، ئەویش ڕەزابوونە،
- ئەگەر کارەساتێکت بەسەر هات، بیرلەوە گەورەتر بکەوە، لەسەرت ئاسانتر دەبێت، بیر لەخێرا تێپەڕ بوونی بکەوە، چونکە بێ ناخۆشی کارەساتەکە، تامی خۆشی لاچوونی نازانی،
- ئەگەر تووشی نەهامەتیەك بووی، بیرلەو هەموو نەهامەتیانەی، خودا ڕزگاری کردی بکەوە، بزانە، ئەوەی یەکەم جار ڕزگاری کردی لەمەودوا دیسان ڕزگارت دەکا،
- ئەو کەسەی ئەمرۆ مافی کەسێکی نەداوەتەوە، یافەرمانی سەر شانی جێبەجێ نەکردووە، یاشکۆمەندی بنیات نەنابێ، یا سوپاسێکی دەست نەکەوتبێ، یاشتێك فێر نەبووبێ، یاسەردانی خزمانی نەکردبێ، یاچاکەیەکی نەکردبێ، بەرامبەر ئەوڕۆژەی خراپ بووە،
- پێویستە هەمیشە لەناو دەستت یالەنزیکت کتێب هەبێت،



www.iqra.ahlamontada.com

چونکه هەندێك جار کاتی وا بەفیڕۆ دەڕوات، کتێب باشترین شته بۆ سوود وەرگرتن لەو کاته.

- ئەوەی هەموو قورئانی ئەز بەر بێت، بەشەوو ڕۆژ بیخوێنێتەوه، بێزار نابێت، هەست بەدەست بەتاڵی و پەرێشانی ناکات، چونکه قورئان هەموو ژیانی پڕکردووه لەکامەرانی.
- بۆئەوەی پەشیمان نەبیتەوه، هیچ بڕیارێك مەده، تابۆئەم مەبەستە، لەهەمووڵایەکەوه سەرنجی نەدەی، ئینجا نوێژی ئیستیخاره بکه، داوای ڕێنمایی لەخودای پەروەردگار بکه، ڕاوێژ بەباوەڕ پێ کراوان بکه،
- مرۆڤی تێگەیشتوو، هاوڕێ زیاد دەکا، دوژمن کەم دەکاتەوه، لەبەر ئەوەی بەیەك ساڵ یەك هاوڕێ پەیدا دەکرێ، دوژمن بەیەك ڕۆژ، ئافەرین بۆئەو کەسەی خوا کردوویەتی بەخۆشەویستی خەڵك،
- تخووب بۆهیواو ئاواتت دابنێ، ئەگەر وانەکەی، پەرێشان و دڵ توندو ژیان تاڵ و کارو بار خراپ و بیرکردنەوەت پەرش و بڵاودەبێت،
- تەندرووستیت قوربانی پارەو سامان یاڕابواردن یاکورسی مەکه، چونکه ئەگەر تەندروستیت لەدەست دا، ئەوانەش نامێنێت ،
- بۆئەوەی نازو نیعمەتەکانی خودا بمێنێتەوه، پێویسته



www.iqra.ahlamontada.com

بەسوپاس و گوێڕایەڵی و نەهێشتنی لووت بەرزی ببەستیەوە،

- لەڕاستیدا تەمبەڵ و سست و خەمسارد، ماندوو خەمبارە، دڵسۆزی خاوەن کار زانی چۆن بژی و چۆن بەختەوەر دەبی،
- خۆشیەکانی ژیان زۆر زیاترە لەناخۆشی و کارەساتەکانی، بەلاَم گرنگ ئەوەیە چۆن بەزیرەکی خۆمان بتوانین بگەینە ئەو خۆشییە،
- ئافرەت ئەگەر هەموو دونیای هەبێت، بروانامەکانی گشت گێتی بەدەست هێنابێ، هەرچی دروشم و نیشانە هەیەلەسەر سینگی بێت، بەلاَم شووی نەکردبێت و مێردی نەبێت، بێ نەواو هەژارە.
- ژیانی تەواو ئەوەیە لەگەنجیدا خەبات بکەی تێبکۆشی بۆ گەیشتن بەهیواو ئاوات، لەپیریشدا بە تێڕامان و بیرکردنەوەبژیت.
- تەنیا گلەیی لەخۆت بکە، چونکە ئەوەندە کەم و کوڕیت زۆرە، کات بۆ خەڵك نامێنێت، گلەییان لێ بکەیت، وازیان لێ بێنە،
- کتێبێك، بیرو هزرت بکاتەوە، دڵت خۆش بکا، دەروون ئارام بکاتەوە، سینەت فراوان بکا، زیرەکت بکا لەکۆشك و خانوو جوانترە،
- داوای لێخۆشبوون و لەشساغی و بێ وەی بوون لەخودا بکە،



www.iqra.ahlamontada.com

چـــونکەئەگەر ئەمانـــەت هـــەبوو، کەواتـــە تـــۆ بەختـــەوەری، هەمووخۆشیەکت دەست کەوت، لەهەموو ناخۆشیەك دووری،

- یـەك نـان و حـەوت دەنکـە خورمـاو جامێـك ئـاوو حەسـیرێك و قورئانێك و ژوورێکت هەبێت، بە دونیا بڵێ بە دوعا،
- کامـەرانی لەخۆبـەخت کـردن، خۆبەکـەم زانـین، چـاکە کـردن، ئازارنەدان، خۆبەدوورگرتن لەخۆویستی و خۆپەرستی داهەیە.
- کەم پێکەنین، دڵ بەهێز و توانـاو ڕوونـاك دەکـا، دەروون خـۆش دەکا، بێزاری ناهێڵێ، بۆکارکردن تین و وزەیە،
- خودا پەرستی کامەرانییە، خۆچاك کردن سەر فرازییـە، ئـەوەی بەردەوام یادی خودا بکا، لـەبارەگای خـودا بپاڕێتـەوە، مرۆڤێکـی چاکە.
- چـــاکترین هـــاوڕێ، بـــڕوای پـــێ بکـــەی، ئاســـوودەبی لەگـــەڵی، نهێنیـــەکانت بپـــارێزێ، بەشـــداری لەچارەســـەری کێشـــەو گرفتەکانت بکا،
- چـاوەڕوانی خۆشـی‌زیاتر مەکـە، تـا ئـەوەی هـەیتت لەدەسـتت نەڕوا، پێشبینی کارەسات مەکە، چـونکە تـۆ بـەم کـارەت خـەم و خەفەت پێش دەخەی،
- وامەزانە، پێویستە هەموو شتێکت هەبێت، چونکە ئەمە نـاکرێ و مەحاڵە،



www.iqra.ahlamontada.com

- ژنێکـــی خـــاوەن بـــاوەڕ، خانوویـــەکی فـــراوان، ڕۆزییـــەکی مامناوەنـدی، دراوسـێی چـاك، لەبەخششـە گـەورەکانی خودایـە، بەڵام زۆر کەس پێی نازانێ.
- بتـوانی ناخۆشـیەکان فـەرامۆش بکـەی نیعمەتـە، بەخششـەکانی خودات لەپێش چاو بێت خێرە، گرنگی نەدان بەخەوشی خەڵك چاکەیە.
- لێخۆشـبوون لەتۆڵەسـەندنەوە بـەتامترە، ئـیش و کـار لەبـەتاڵی خۆشـــترە، قەناعـــەت لـــەپارەو ســـامان گـــەورەترە، تەندروســـتی لەسامان باشترە،
- تـەنیایی لـەهاوڕێی خـراپ باشـترە، هـاوڕێی بـاش لەتـەنیایی باشـــترە، خـــەڵوەت خـــودا پەرســـتیە، یـــاد کردنـــەوەی خـــودا گوێڕایەڵییە،
- گۆشـە گـیری کیشـوەری بیرکردنەوەیـە، زۆر تێکـەڵاوی خـەڵك نەفامییـە، بـاوەڕ بەخـەڵك گەمژەییـە، بـەر بـەرەکانی یـان بـەد خووییە.
- بـەد ڕەوشـتی ئـازارو چـەرمە سـەرییە، قـین ژهـرە، پاشملـە باسـکردنی خـەڵك ڕیسـوابوونە، گـەڕان بـەدوای عـەیب و عـاری خەڵك سەر شۆڕی یە.
- سوپاســگوزاری ڕق و تـــووڕەیی لادەبـــات، واز لـــەگوناه هێنـــان،



www.iqra.ahlamontada.com

ژیانــەبۆدڵ، گــەورە پیــاوان تــام وچــێژی، ســەرکەوتن بەســەر دەروون دەچێژن،

- نانی وشك و ژیانی ئارام، بەتامترە لەهەنگوین و ترسان، ژیانی بێ کەم و کورِی ناو ڕەشماڵ، خۆشترە لەژیان لەناو کۆشك و تەلار، لەگەڵ هەبوونی گێچەڵ و ئاژاوە.
- بەزانست شاد بوون هەتا سەرە، نەمرە، دەمێنێتەوە، بەلاّم بەپارەو سامان، هەتا سەر نییە، نامێنێتەوە، کۆتایی دێت ،
- بەدونیا شاد بوون بۆ منداڵانە، بە ئیمان شاد بوون بۆ پیاو چاکانە، خزمەت کردنی پارەوسامان سەر شۆڕییە، خودا پەرستی سەر بڵندی یە.
- ویستی مەردانە ئازاریشی خۆشە، کار ئەنجامدان ئاسوودەییە، ئارەقەی کار کردن میسکە، بەچاك باسکردن خۆشترین بۆنە،
- بەختەوەری بریتییە لە: قورئان هاو دەمت بێت، ئەو کارەی دەیکەی ئارەزووی خۆت بێت، ماڵەکەت بکەیتە پەرستگا، دڵنیایی و ڕازی بوون سامانت بێت،
- کەیفخۆش بوون بە خواردن و پارە بۆمنداڵانە، بەچاکی باسکردن هی داناو گەورە پیاوانە، چاکە هەرگیز ناسڕێتەوەو نامرێ،
- شەو نوێژ گەشی ڕوخساری موسڵمانانە لە ڕۆژدا، خۆشەویستی



www.iqra.ahlamontada.com

خەڵك لەپاك و خاوێنی ویژدانەوەیـە، چاوەڕوانی هانـای خـودا، بە خودا پەرستی دەژمێردرێت،

- لێ قەومان چوار بەهرەی تێدایە، پاداشـت، ژیـان لەگـەڵ سـەبرو خۆڕاگری، یادکردن بە چاکە، چاوەڕوانی میهرەبانی خودا ،
- نوێژ بـەکۆ، بـە جێهێنـانی فـەرزەکان، خۆشەویـستی موسـڵمانان، واز لــەگوناه هێنـــان، خـــواردنی لوقمـــەی حـــەڵا ڵ، ســـەربەرزی دونیاو قیامەتە،
- هـەرگیز لەشـوێنی سـەر مەبـە، چـونکە زۆر ژان دەکـا، هـەولّی بەناو بانـگ بوون مەدە، باجی خۆی هەیە سستـی تـۆ، هـەبوونی رۆژی کامەرانی یە،
- لەنیشـانەکانی نـەفامی: بــە فیرۆدانــی کــات، تەوبــە دواخســتن، دوژمنداری خەڵك، ئازاردانی دایك و باوك، ئاشکراکردنی نهێنـی،
- دڵ مــردن بــە، واز هێنــان لـەخودا پەرسـتی، گونــاهکردن، گـوێ نــەدان بــەخراپ باسـکردن، لەمــەکری خــودا ئاســوودە بــوون، سووکایەتی بەپیاو چاکان، دەناسرێتەوە،
- ئـەوەی لـەماڵی خـۆی بـەختیار نـەبێت، لـە هـیچ شـوێنێکی تـر بــەختیار نابێـت، ئـەوەی کەسـوکاری خۆشـیان نــەوێت، کـەس خۆشـی ناوێـت، ئـەوەی ئـەمڕۆی لەدەسـت بـدا سـبەش لەدەسـت دەدا.



www.iqra.ahlamontada.com

- چوار شت بەختەوەری دەهێنن : کتێبیی بەسوود، کوڕی گوێ ڕایەڵ، هاوسەری بەڕێزو خۆشەویست، هاوڕێی چاك، خوداش زۆر زیاتر لەلایە،
- هەوڵ و کۆششی زاناو دانایان بۆباوەڕو تەندروستی و دەوڵەمەندی و ئازادی و ئارامی و گەنجی و زانستە،، بەلاَم دەگمەنە هەموی دەستەبەر بکرێت.
- ئێستا بەکامەرانی بژی، چونکە لەمانەوەت مسۆگەرنیت، هیچ گرەنتیەکت بۆدووری لەکارەساتەکانی ژیان وەرنەگرتووە، خەم بەحازر، خۆشی و شادیش بەقەرز مەکرە،
- لەم دونیایەدا لەهەمووشتێك باشترە، باوەڕی ڕاستە قینە خوڕەوشتی چاك، ئەقلێکی باش، لەشێکی ساغ، گوزەرانی خۆش، دوای ئەوانە هیچ نییە، تەنیا خۆخەریك کردنە،
- دووبەهرەو چاکە شاراوەیە، تەندروستی و ژیانی ئارام، دووبەهرەو چاکەش دیاروبەرچاوە، ستایش و نەوەی چاك،
- دڵی شادو گەش میکرۆبی قین لەناو دەبا، دەروونی ڕازی زیندەوەری ڕق قەڵاچۆدەکا.
- ئاسوودەیی نەرمترین نوێنە، تەندروستی چاك باشترین داپۆشەرە، زانست خۆشترین خواردنە، خۆشەویستی باشترین دەرمانە، پاراستنی خودا چاکترین جلو بەرگە.



www.iqra.ahlamontada.com

- بەختەوەر ئەوانە نییە: بەد ڕەفتار، نەخۆش، قەرزار، لانەواز، خەمگین، زیندانی، پیاوی ناحەز.
- کامەرانی: نەمانی گێچەڵ، لاچوونی ناخۆشی و دوژمنایەتی، چاکە کردن، زاڵ بوون بەسەر ئارەزوو،
- ڕێگای ماڵەوە بێ مەترسیترین ڕێگایە، بەبەرەکەتترین ڕۆژ ئەو ڕۆژەیە چاکەی تیابکەیت، بەد فەرترین ڕۆژ خراپەی تێدا بکەی،
- ئەگەر جنێویان پێ دای، ئەوانە جنێویان بەخوداش داوە، ئەوانەی لە نەبوونەوە هێنابوون، گومان لە بوونی پەروەردیگاریش دەکەن، خودا دروستی کردوون، سوپاسی یەکی تر دەکەن، لەمەترسی ڕزگاری کردوون، بەربەرەکانی دەکەن،
- خەمی هەموو دونیاو خەڵکی مەخۆ، وامەزانە بارو دۆخی ئێمەیان لاگرنگە، باوەڕبکە ئەگەر یەکێکیان تووشی هەڵامەت بێت ئێمەیان لەبیر نامێنێت،
- کامەرانی، کاسەی پڕو نیشتمانە، سەلامەتی و خانووە، دوور بوون لەئاژاوەیە، ڕزگار بوون لەکێشەو تەنگو چەڵەمەیە، سوپاسگوزاری چاکەیە، خودا پەرستییە تامردن،
- (لەدونیا وەکو ڕێبواری لانەوازبە)فەرموودەیە لەگێڕانەوەی بوخاری.



www.iqra.ahlamontada.com

- (نوێـژێك بكـە، وابزانـە دوا نوێـژ ئـەنجام دەدەی)فەرموودەیـە لەگێڕانەوەی ئیبن ماجە
- (قسـەیەك داوای لێبـوردنی لـەدواوە بێـت، مەیكـە) فەرموودەیـە لەگێڕانەوەی ئیمام ئەحمەد
- (بەتــەواوی بــێ ئومێـد بــە لەدەســتی خــەڵك) فەرموودەیــە لەگێڕانەوەی ئیبن ماجە
- زۆر چـاوت لـەدونیا نـەبێت، خـودا خۆشـی دەوێـت، چـاوت لەدەسـتی خـەڵك نـەبێت، تۆیـان خـۆش دەوێـت، بـەڕۆژی كـەم قەناعەتت هەبێ، گوێ ڕایەڵی قورئان بكە، ئامادەی ڕۆیشتن بـە، لەخوداش بترسە.
- ژیان بۆ قیزەون نابێ، حەسانەوە بۆ دوژمندار نیـە، ئاسـوودەیی و ئارامی بۆ گوناهبار نیە، بەد كار كەس خۆشی ناوێت، سـوپاس و ستایش بۆ درۆزن نیە، متمانە كردن بۆ زۆر دار نییە،
- (سـەر سـوڕمان بـۆ بـاوەڕ دار، هەمـوو شـت بـۆ ئەوباشـە، ئەگـەر خۆشی هاتـە ڕێگـا سوپاسـی خـودا دەكـا، خێـری بـۆ دەنووسـرێ، ئەگــەر تووشــی ناخۆشــی بــوو، ئــارام دەگــرێ، خێــری بــۆ دەنووسرێ) فەرمودەیە لەگێڕانەوەی موسلیم،
- بــزە خەنــە كلیلــی شــادییە، خۆشەویســتی دەرگاكەیــەتی،، كەیفخۆشــی باخچــەكەیەتی، بــاوەڕ روناكیەكەیــەتی، ژیــانی


www.iqra.ahlamontada.com

ئاسوودە پەر ژینیەتی،

- شادمانی بریتیە لە : ڕوخساری جوان، باخچەی سەوز، ئاوی ساردو سازگار، کتێبی بەسوود، دڵی شوکرانە بژێر و چاکە ویست، دووری لەگوناە،
- تەندروست باش و لەش ساغ، لەسەر بەرد بخەوێ وادەزانێ ئاوریشمە، نانی جۆ بخوا وادەزانێ تێکوشینە، لەکۆلیت بژی وادەزانی تاقی کیسرایە،
- پیسکەو ڕەزیل، بەهەزاری دەژی، پاسەوانی سامانە، کەمرد بۆنەوەکەیەتی، خەڵکی ڕقیان لێ یە، لەخودای پەروەردگار دوورە، لەناو خەڵك بەد ناوە،
- منداڵ لەسامان وپارە باشترە، تەندروستی لەدەوڵەمەندی چاکترە، بێ ترس ژیان لەخانوو ماڵ لە پێشترە، تاقی کردنەوە بەنرخترە لەپارە،
- دڵشادی بکە شوکر، خەم بکە ئارامی، بێ دەنگی بکە بەتێڕامان، تەماشاکردن بکە بەعیبرەت وەرگرتن، ژیانت بکە بەپابەند بوون بە فەرمانی خودا، مردن بکە بەهیواو ئاوا ت،
- وەکو باڵندە وابە، گرنگی بە بەیانی نادا، باوەڕ بەکەس ناکا، کەس ئازاری نادات، ئێسك سووك، ڕەفتارو جووڵەی نەرم، بەیانی و ئێوارەڕۆزیی بۆ دێت،



www.iqra.ahlamontada.com

- ئەو کەسەی خۆی زۆر لەخەڵکی نزیك بکاتەوە ڕیسوای دەکەن، بەرامبەریان قرچۆك و ڕەزیل بێت قینی لێ هەڵدەگرن، ڕەفتاری لەگەڵیان نەرم بێت ڕێزی دەگرن، بەخشندەو جوا مێر بێت خۆشیان دەوێت، پێویستی هەبێت پێیان ڕقیان لێ دەبێتەوە،
- گەردوون لەخولانەوەدایە، شەو بەبەر هەمە، هەر ڕۆژ دونیا بۆکەسانێکە، ژیان لەگۆڕاندایە، مەحاڵە وەکو خۆی بمێنێتەوە، خوداش هەر ڕۆژێ بە جۆرێکی جیا خەریکە(کل یوم هوفی شأن)، کەواتە بۆ خەمبار دەبی؟،
- دڵی پاشاو سوڵتانان لەبەر دەستی خودایە، چۆن لەبەر دەرگایان دەوەستی، پارەو سامان لەهەژار داوادەکەی، شت لە ڕەزیل داوادەکەی، سکاڵای خۆت بۆ لێ قەوماو باس دەکەی،
- بەیانیان سەر لەزوو، نامەکانت، مەرەکەبی ڕۆندك بێت، کاغەزی ڕومەت بێت، پۆستەی گیرا بوون بێت، ڕووەو عەرشی خودا بنێرە، چاوەڕوانی وەلأم بکە،
- لەناو نوێژ، لەکاتی سوجدە، داواکاریەکانی خۆتی پێ بڵێ، ئەو لەمەش پەنهانیتر ئاگادارە، دۆستایەتی نهێنی تایبەتی خۆی هەیە، باکەس بەمە نەزانی، خەڵکیش دووجۆرن، یاباش یاحەسود،



www.iqra.ahlamontada.com

- پاکی و بێ گەردی بۆ ئەو خودا یەی، ملکەچی و گوێڕایەڵی کردۆتە بنەمای ڕێزو گەورەیی، چاو لەدەستی بەخشندەیی پەروەردگار دەوڵەمەندییە، پابەند بوون بەفەرمانەکانی بەرزییە، بۆ مرۆڤ تەنیا پشت بەستان بۆ ئەو بەسیەتی.
- ئەگەر کەسێکت مرد یان خەم و خەفەت و کارەساتێکت بەسەر هات، بێ ئومێد مەبە، لەوانەیە خودای پەروەردگار دواى ئەمە بە چاکی بۆت بگۆڕی،
- ﴿حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾آل عمران/١٧٣، لەبیر مەکە، ئاگر دەکو ژێنێتەوە، مرۆڤ لەمردن ڕزگار دەکا، ڕێی پێ دەدۆزرێتەوە، پەیمانی گرنگی تێدایە.
- ئەی باڵندە، بە خۆشی وشادی بژی، دەچیتە سەر ڕووبار، لەسەر دار دەژی، میوە دەخۆی، مەترسی لەسەرت نییە، ناچیتە دۆزەخ،
- ماوەی خۆشی کورتە، خەم گوناه دەسڕێتەوە، تووڕە بوون بریسکەی ئاگرە، دەست بەتاڵی زیانە، خودا پەرستی بازرگانییە،
- دوێنێ مرد، ئەمڕۆش بەهەمان شێوە دەڕوا، سبەش نەهاتووە، تۆ کوڕی ئێستای، چاکترین قازانج دەکەی، ئەگەر گوێڕایەڵی خودابیت،


www.iqra.ahlamontada.com

- ئەگەر هاوڕێ قەڵەم و گۆمی ئاو مەرەکەب و کتێب هاو دەم و ماڵەکەت و ڵات و هێزو توانا گەنجینەو سامانت بێت، خەمی ئەو دونیایەت نەبێت،
- لەوانەیە سەرەتای کارەکان دەردەسەری بێت، کۆتاییەکەی کامەرانی، وەکو هەر سەرەتا بروسك وهەوره تریشقەیە، کۆتاییەکەی بارانێکی بەسوود،
- تەوبەو داوای لێخۆشبوون، دەرگا دەکاتەوە، دڵ و دەروون خۆش دەکات - ڕق و قینە و گەندی ناهێڵێت، بۆ ڕۆزی زۆر پێشەکی کرینە، هیوای کار ئاسانییە،
- شەش شت بۆمرۆڤ بەسەو چارە سەرە : ئایین، زانست، دەوڵەمەنی، پیاوەتی، لێ بوردەیی، تەندروستی،
- کێ لێ قەوماو ڕزگار دەکا، کێ فریای خنکاو دەکەوێ، کێ پەرێشانی و کارەسات لەسەر ئەو کەسە لادەبات کە دەلێ یا الله ؟ بێ گومان خودا،
- لەمشتو مڕو دەمەقاڵیی بێ سوود و لەدانیشتن لەشوێنی خراپ و هاوڕێی بەد خوو دوور بکەوە، چونکە هاوڕێیەتی کێ بکەی خوڕەوشت و هەلسوکەوتت وەکو ئەوی لێ دێت،
- گوێگری چاك، نە بڕینی قسە، ڕەفتاری نەرم و خوڕەوشتی جوان، لەسەر سینگی پیاو نیشانەو مەدالیایە،



www.iqra.ahlamontada.com

- دووچاوو گوێ و دەست وقاچت هەیە، هەروەها زمان و ئیمان و قورئان و ئەمان، ئەی کوا شوکر ﴿فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبانِ﴾ الرحمن/١٣،
- لەسەر پێیەکانت دەڕۆی، هەیە پێی نیە، دووقاچت هەیە، هەیە قاچی نیە، دەخەوی، هەیە لەبەر ئازار خەوی لێ ناکەوێت، تێر دەخۆی، هەیە برسییە، نان نیە بیخوات.
- کەڕی و لاڵی و کۆرەیی و بیرۆت تووش نەبوو ە، لەبەڵەکی و شێتی و گرووپی ڕزگارت بووە، لەسیل و شێر پەنجە دووری، ئەری سوپاسی خودات کردووە ؟
- کارەساتەکەمان، بۆ ئێستا هیچمان پێ ناکرێ، خەریکی ڕابردووینە، ئەمرۆ پشتگوێ دەخەین، گرنگی بەداهاتوومان دەدەین، کوا ئەقڵ و حیکمەت لێرە،
- ڕەخنەی خەڵك واتە لەوان لەپێشتری لەزانین، لەتێگەیشتن، لەپارەو سامان، لەپلەو پایە، لەشان و شکۆ، لەبەر ئەمە شایەنی باسکردن و ئاماژە پێ کردنی،
- لاسایی کردنەوەی کەسایەتی خەڵك مردنە بۆکەسایەتی خۆت. لەچاو کردنەوەی ڕەفتاری خەڵك، خۆ لەناو بردنە،﴿قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ مَشْرَبَهُمْ﴾ البقرة/٦٠

واتە : بێگومان هەر هۆزێك چاوگەی خۆی ناسی. (ت : ئاسان)



www.iqra.ahlamontada.com

- ﴿وَلِكُلٍّ وِجْهَةٌ هُوَ مُوَلِّيهَا﴾ البقرة/١٤٨

واتە: بۆ هەر گەلْ و میللەتێك ڕوگەو قیبلەیەك هەیە، خوا ڕوویان وەردەچەر خێنێت بۆ لای. (ت : ئاسان)

- ﴿صِنْوَانٌ وَغَيْرُ صِنْوَانٍ يُسْقَى بِمَاءٍ وَاحِدٍ﴾ الرعد/ ٤.

واتە: دار خورمای یەك قەدو دوو قەد، هەموو ئەمانە بەیەك ئاو ئاودێر دەكرێن و لەیەك جۆر ئاو دەخۆنەوە. (ت : ئاسان)

- (لاتكونوا إمعة) حديث ضعيف رواه الترمزي،

واتە: شوێن كەوتەو لاسایی كەرەوە مەبن،(فەرموودەیەكی لاوازە لەگێڕانەوەی تورمزی).

- لەدوای فرمێسك زەردە خەنەدێت، لەدوای كارەسات خۆشی دێت، لەگەلْ لێ قەومان بەخشین هەیە سونەتێكی چەسپاوە، هاوكێشەیەكی نەگۆڕە،
- تەماشابكە، لەهەموولایەك غەمبار هەیە، لەهەموو ماڵێك گریان، لەسەر هەموو ڕومەتێك ئەسرین هەیە،
- سوپاسكردنی كەسێك چاكەت لەگەڵی كردبێ، لەدەنگی بولبول و بای شەماڵ و جولەی دارو درەخت، ئاوازی خۆشترە،
- بۆكاتێك ئاوی سارد دەخۆیەوە، كۆئەندامی لەشت، هەموو دەڵێن سوپاس بۆخودا، بەڵام ئەگەر ئاوەكە گەرم بێت، بەئەر كەوە سوپاسی لەسەر دەكەی ؟



www.iqra.ahlamontada.com

- هەرزانترین کاڵا لەبازاڕی ئاقڵان ئەوەیە : واز بێنە لەو شتەی پەیوەندی بەتۆوە نیە، بەنرخترین کاڵاش ئەوەیە : چۆن بتوانی خەڵك بکەیتە هۆگری خۆت، خۆشت بکەیتە هۆگری خەڵك،
- نەکەی خەم بخۆی ژەهرە، بێ دەسەڵاتی مردنە، تەمبەڵی نەکەیت نائومێدییە، شپر زەیی لەبوونی ڕا، بێ پلانییە،
- ئەو کەسەی ئاین ڕێنمایی بکات، ئەقڵ ڕابەری بێت، پلەو پایەی خۆی بپارێزێت بەشەرم و خاوەن خو ڕەوشتی جوان بێت، کەواتە خاوەن هەموو بەها پیرۆزەکانە.
- دراوسێی خراپ لەئاوارەیی خراپترە، چاکە لەکۆشك و تەلار بەرزترە، بەچاکی باسکردن نەمرییە،
- ئەو کەسەی لەناکۆکی واز بهێنێ، لەخۆهەڵکێشان دووربێت، درۆنەکا، بەقەزاو قەدەری خودا ڕازی بێت، ئیرەیی بەکەس نەبات، خودای پەروەردگار دڵی بەندەکانی بۆلای ئەو ڕادەکێشێ،
- هەرکەسێك سووکایەتی بەدەسەڵات بکا دونیای دەچێ، بێ ئەدەبی بەرامبەر مەلا بکا ئاینی دەچی، گاڵتە بەهاوڕێی بکا جوامێر نییە، ئەوەی بەئەندازەی یەك مسقاڵ گەردیلە بێ ڕێزی بەرامبەر خوداو قورئان و پیرۆزەکانی ئیسلام بنوێنی


www.iqra.ahlamontada.com

دونیاو قیامەتی دەچی،

- پێویستی خەڵك بەتۆ، بەخششی خودایە، لێی بێزار مەبە، ئەگینا دەبێتە ئازار، باش بزانە ڕووتێکراوو بیستراو بیت باشترە نەك بە پێچەوانە،
- هەموورۆژێ پێش نووستن، گەردنی خەڵك ئازاد بکەو لێیان ببوورە، دڵت حەوت جار بە ئاوی تەوبە بشۆ، ئینجا جارێك بەخۆڵ و خاك. هەست بەتام و لەزەتی ئیمان دەکەی،
- زانست و زانین لەتەنیایی هۆگرە، لەئاوارەیی هاوڕێیە، لە خەڵوەت چاودێرە، پێشەوایە بۆ چاکە، کاتی تەنگانە پشتیوانە، دوای مردن ئازوو قەیە،
- دڵێکی گوێڕایەڵ و چاوێکی بەئەسرین و دەروونێکی بە قەناعەتی هەبێت، ئەگەر جلو بەرگ و پێڵاویشی دڕابێت، کاریگەری نابێت و زیانی نییە،
- ڕوولەدونیاو دوور لەپەیڕەو کردنی فەرمانەکانی خودای پەروەردگار، هۆکاری خەم و پەژارەیە، بۆ نموونە ئەوەی بەبەند کردنی هەتا هەتایی حوکم درا، نە زیندووە ئومێدی دەرچوونی هەبێت، نەمردووە پرسەی بۆدابنرێت،
- باشترین سامان کانییەکت هەبێت، ئەگەر نووستی هۆشیارو بێدار بێت، ئەگەر لەوێش نەبیت جێ پەنجەت دیارە، دوای



www.iqra.ahlamontada.com

مردنیش خێرەکە بەردەوام دەبێت،

- بە بێ دەنگی بەخت و چارە نووست دەدۆزیەوە، مرۆڤی کڕ سام و هەیبەتی هەیە، بە گوێگرتن لەخەڵك خۆشیان دەوێیت، بەڵاو کارە سات بەستراوەتەوە بە زمان.
- ژیان بریتیە لە: خۆئامادەکردن بۆدوای مردن، کارو کاسبی، تام و چێژ بەحەڵاڵی، خۆداناو زیرەك کردن، دەروون پاکی، دوای ئەمانە هیچی تر نی یە،
- گۆشە گیری و تەنیایی دوورت دەکا لە، ئیرەبەر، مرۆڤی گاڵتە باز، ئێسك گران، غەیبەت کەر، لووت بەرز، خۆبەزل زان،،....... ئەم سوودانەش زۆرن،
- بۆلابردنی خەم و پەژارە، لەوڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر گەشت مەکە، بەڵکو ناو دەروونت بگۆڕە،
- دڵت باش و ڕۆحت بەرز بێت، بەیانیت گوڵ و گوڵزارە، شەوت ئاهەنگە خەڵکی خۆشەویستی تۆیە، کۆلیتە خانووت هەبێت، کۆشك و تەلارە.
- یەکێك لەبەخششەکانی خودای پەروەردگار، بۆمرۆڤی خودا پەرست و گوێڕایەڵ، دەوڵەمەندی دڵە، ئەگەر چەند پاروە نانێکی هەبێت، وادەزانی دونیا هەموو هی خۆیەتی،
- ژیان بێ وەیی و لەش ساغییە، گەنجی تەندروستییە، جوامێری



www.iqra.ahlamontada.com

سەبرەو گەورەیی تەقوایە، پلەو پایە سامانە،

- بەد بەختترین کەسە ئەوەی بچێتە مالێکی تر، بێ ڕەوشتی بکا، ناڕازی بێت بەقەزاو قەدەرو ڕۆزی خۆی،
- ئەو کەسەی بەردەوام هاموشۆی مزگەوت بکا، ئایەتی پیرۆزو جوان، برای ڕاستە قینە، زانستی چاك، بەزەیی چاوەڕوانکراوی پەروەردگار، قسەی سوود بەخش، تەوبەو نەگەڕانەوە سەر گوناهی چنگ دەکەوێت.
- لای مرۆڤی بەڕۆژوو، خواردن خۆش و بەتامە، شەو نوێژ کردن نووستنی خۆش دەبێت، ئەوەی چاکە کاربێت، شایانی سوپاسی زۆر دەبێت، خاوەن دەسەلات ئیرەیی بەری زۆر دەبێت،
- کامەران نابیت، مەگەر لەش و ئەقلّ و ویژدان و ئەندێشەت، لەژێر هیچ دەسەلاتێك نەبێت، تابەندەی خودا بیت و بەس،
- بەختەوەر ئەو کەسەیە، خراپە لەبیر دەکات، چاکەو پیاوەتی لەبیر ناکات،
- ڕۆزیت لەتۆ زیاتر شارەزای شوێنتە لەتۆ بۆ شوێنی ئەو، وەکو سێبەر بە دواتەوەیە، تاهەموو ڕۆزیت تەواو نەبێت نامری،
- نەبوونی ئەوەیە، کارت بەپیاوی ڕژدو پیسکە بێت، هەزار ئەو کەسەیە زۆری بەکەم دابنێ، کوێریش ئەو کەسەیە عەیبەکانی خۆی نەبینێت،



www.iqra.ahlamontada.com

- ئــەو کەســەی گەیشــتە بــەرزترین هیــواو ئــاواتی، باچــاوەڕێی کارەسات و ناخۆشیش بکا، تەنیا خودا پەرستی، سەرەنجامەکەی ڕەزابوون و چوونە بەهەشتە،
- شایەنترین کەس بۆزۆربوونی نیعمەتەکانی خـودای پـەروەردگار سوپاســگوزارترینیانە، لەپێشــترین کــەس بــۆڕێزو خۆشویســتن، چاکە کارو بێ ئازار بێت،
- کامەرانی پێویستی بە ئارامی هەیە، پـارەو سـامان پێویسـتی بـە خێـرو چـاکە هەیـە، پلـەو پایـە پێویسـتی بـە شـەفاعەت هەیـە، فەرمانڕەوایی پێویستی بە خاکە ڕایی هەیە،
- مانـدووبوون نـەبێ، ئاسـوودەیی چـنگ ناکـەوێ، شـەونخوونی و کارکردن نەبێت، ژیانی خۆش بەدەسـت نـاهێنرێ، خۆشەویستی و ڕێزیش بە ڕەوشتی جوان دەبێت،
- منــداڵ لەســامان گــرنگترە، خوڕەوشــت لەکورســی بــەرزترە، دەروونــی بــە ئومێـد لەشـارەزایی لـە پێشـترە، تـەقوا لەنـەمری مەزنترە،
- هەرچی بیستت تەماعی لێ مەکە، پشت بەهـەموو هاوڕێیـەکت مەبەســتە، نهێنییــەکانت بــەئافرەت مــەڵێ، بــەدوای هــەموو ئاواتێك مەکەوە.
- سـانەوەم نـەدیت، تـەنیا کـاتی تـەنیایی، ئـارامیم نـەدیت، تـەنیا



www.iqra.ahlamontada.com

لەگەڵ خواپەرستی، دۆستایەتیم نەدیت، تەنیا لەگەڵ وەفاو دڵسۆزی، باوەڕپێکردنم نەدیت، تەنیا لەگەڵ ڕاستگۆیی نەبێت ،

- لەوانەیە یەك خواردن، چەندین خواردنت لێ حەرام بکات، وشەیەك دوژمنداری دروست بکات، گوناهێك چەندین خێرو چاکەو بەخشش نەهێڵێت، یەك تەماشا، چەند ئاهو ناڵە و حەسرەت بەجێ بهێڵێ،
- باخۆشویستنت ئەرك نەبێت، بارِق لێبوونەوەت زۆر نەبێت، با ژیانت تەنیا ڕابواردن نەبێت، بابیرکردنەوەت بەپەشیمانییەوە نەبێت، بامەبەستت بۆپەیدا کردنی ناو نەبێت،
- هەر کەس لەماڵی خۆی میرو ئاغایە، کەس ڕیسوای ناکات، کەس دەستی ناگاتێ، ستەمکار پەرێشانی ناکات، پیسکەو ڕەزیل نا ئومێدی ناکات،
- خۆشترین ڕۆژ ئەو ڕۆژەیە، دڵت نەرمتر بوو، زانیاریت زیاتر بوو، گوناهت تێدا نەکرد، تێگەیشتنت زیادی کرد، هیواو ئومێدی زیاتری پێ بەخشی.
- ژیان فر سەتە، نازانین تائەو کاتەی لەدەستمان دەڕوات، تەندروستی باش تاجە لەسەرسەری مرۆڤی لەش ساغ، تەنیا نە خۆش دەیبینن،
- کەی بە خۆشی دەژی، ئەوەی کوڕێکی سپلەو ژنێکی شەڕانی و


www.iqra.ahlamontada.com

دراو سـێیەکی خـراپ و هـاوڕێی ئێسـك گـران و دەروونێکـی ئارەزوو بازو خراپی هەبێت !

- خودای پـەروەردگار، خۆت، چاوت، هاوسـەرت، مێوانـت، مافیـان لەسەرت هەیە، بەشی هەموو خاوەن مافێك بدە،
- بـەیانیان تەماشـای خـۆر هـەڵاتن وسـەرەتای ڕۆژی تـازە بکـە، جوانی و هەیبەتی هەیە، دڵ ڕۆشن و پڕ ئومێد دەکا،
- بەیانی زوو دەست بـەکارەکانت بکـە، وەکو یـادی خـودا، قورئـان خوێنـدن یـا ئەزبـەر کـردن، یاخوێندنـەوەو نووسـین، یاسـەفەر، چونکە بە پیت و پیرۆزە،
- لەژیان مامناوەندی بە، لەتەنیشت ڕێگا برۆ، خودا لـەخۆت ڕازی بکە، بـەزەییت بـۆ خـەڵکی هـەبێت، فـەرزەکانت جێبـەجێ بکـە، نوێژو ڕۆژی سونەتت هەبێت، تۆتێکەیشتووی،
- قسەی چاك، کاری چاك، دووربـوون لەسـتەم، هـامو شـۆی خـزم، ئاخیر خێر، سەر فرازی و ڕزگار بوونە.
- لەوانەیە یـەك وشـە، بەخشـێك نـەهێڵێت، یـەك هەڵە تووشـی سـەر شـۆڕیت بکـات، کەواتـە تـەنیایی و گۆشـە گـیری خۆشـە، سەربەرزییە.
- (موسڵمان ئـەو کەسـەیە، موسـڵمانان لەدەسـت و زمـانی بـێ وەی بـن، ئیمانـدار ئـەو کەسـەیە، خـەڵکی لـەگیان و سـامانیان لێـی


www.iqra.ahlamontada.com

ئــــەمين و دڵنيــابن) ئــەم فـــەرمووده، تـــورمزی و نەســـائی گێڕايتيانەوه،

- (موهـاجير، ئـەو كەسـەيه لـەكردنی گونـاح‌و تـاوان هيجرەتـی كـردووه) ئـەم فەرموودەيــه بوخـاری و نەسـائی و ئـەبوداود و ئەحمەد گێڕايتيانەوه،
- باشـترين سـامان ئـەوەی سـوودی بۆتۆهـەبێت، باشـترين زانسـت ئـــەوەی پلـــەو پايـــەت بەرزبكاتـــەوه، خۆشـــترين مـــاڵ تێيـــدا بحەسێيتەوه، چاكترين هاوڕێ ئەوەی ئامۆژگاريت بكات،
- ئەگەر كەس ئيرەيی پێ نەبرديت، دياره هيچت پێ نييه، ئەگـەر بێ هاوڕێ بووی، ديـاره هەڵسوكەوت و خوڕەوشـتت بـاش نييـه، ئەگەر ئاينت نەبوو دياره هيچ بيرو ڕايەكت نييه،
- دڵت بەياد كردنەوەی چاكەكانت وتەوبـەو پەشـيمانی ئاسـوودەو خۆش بكه، بەدەستی سپی دەست لەملان بكه،
- قەڵـەو بـوون بـێ ئاگاييـه، زۆر خـواردن زيرەكـی نـاهێڵێ، زۆر نووســتن بــەزين و دۆڕاندنـــه، پێكـــەنينی زۆر دڵ دەمـــرێنێ، دوودڵی و نيگەرانی ئازاره،
- شيری فەرمانڕەوايی شـيرينه، واز هێنـان لێـی تاڵـه، ناخۆشـی لـێ ســـەندنەوەی دەســـەڵات خۆشــــيەكەی نــــاهێڵێ، كورســــی لەخولانەوەدايه،


www.iqra.ahlamontada.com

- لەخۆشیەکانی ژیان : سەفەرکردن لەگەڵ ئازیزان، دووری لەو کەسانەی ڕقت لێیانە، سەلامەتی لەگشت ئەزیەت وئازار، یادکردنەوەی ناجح بوون،
- چاکە پیاو دەکاتە بەندە، خێرو چاکە مرۆڤ دەبەستێتەوە، نەرمی دوژمن دەبەزێنێ، سەبرو ئارامی پۆلییە ئاگر دەکوژێنێتەوە،
- کەی دونیا بەهیچ دانەنێی، خۆشتر دەبێت، هەر پێداویستیەك کارت پێ نەبێ، لەهەموو شتێك هەرزانتر دەبێت،
- ئەگەر خەمی ڕۆزیی بەیانیتە، کێ دەڵێ تۆلەژیانداى، ئەگەر خەم لەدوێنێ دەخۆی، کێ دەیگەڕێنێتەوە،
- کاری بەردەوام لەپارەی زۆر باشترە، ژیان بەگۆشە گیری و سەربەرزی لە دەسەڵاتداری و سەر شۆڕی باشترە، تەمبەڵی لەخودا پەرستی لەچوست و چالاکی لەگوناحو تاوان کردن باشترە،
- چاوتێر پاشایە، زۆر سەرف کەر گێڵە، تووڕە شێتە، پەلەکەر گەوجە، ئیرە بەر ستەمکارە،
- یادی خودای پەروەردگار، خودا ڕازی دەکا، مرۆڤ دڵخۆش دەکا، شەیتان ملشۆڕ دەکا، خەم و خەفەت ناهێڵێ، تای تەرازووش پڕدەکا،



www.iqra.ahlamontada.com

- ئەو کەسەی تەمەنی درێژبێت و کاری چاکە بکا بەختەوەرە، ئەو کەسەی سامانی زۆربێت، خێرو چاکەی پێ بکات سەرکەوتووە، ئەو کەسەی زانست و تێ گەیشتنی زیاد بکا تەقوای زیاتر بێت پیرۆزە،
- پاداشی ئەو کەسەی گرنگی بەخەڵك وخەریکی کاروباریان بێت، لەبیرچوونەوەی خەم وخەفەتە، پاداشی ئەو کەسەی لەخزمەت و فەرمانەکانی خودا بێت، خزمەتی خەڵکە، پاداشی ئەو کەسەی واز لەدونیا بهێنێت، ڕۆژییەکی چاکە،
- بەتەندروستی باش، نیعمەت بەکەم مەزانە
- بەبێ تەوبە، گوناح بە بچووك مەزانە
- بە بێ دڵسۆزی، خودا پەرستی بەزۆر مەزانە
- دڵخۆشبوون بە دونیا بۆ منداڵانە
- دڵخۆشبوون بەباسکردن بە چاکە بۆ پیاوانە
- دڵخۆشبوون بەوەی لای خودا هەیە، بۆ پیاو چاکانە،
- ڕاستگۆیی ئاسوودەییە، درۆ گومانە، شەرم پاراستنە، زانست بەڵگەیە، ڕەوانبێژی جوانییە، بێ دەنگی داناییە،
- شیرینی بە ئاوات گەیشتن، تاڵی سەبر دەسڕێتەوە، تامی سەرکەوتن ماندووبوون و مەینەتیەکانی ناهێڵێ، کارکردن بەشارەزایی و کارزانی، ئازاری ناهێڵێ،


www.iqra.ahlamontada.com

- خۆشترین شت لەدونیا خۆش ویستنی خودایە.
- خۆشترین شت لەبەهەشت بینینی خودایە.
- بەسوود ترین کتێب کتێبی خودایە (قورئان).
- دڵسۆزو باشترین ئادەمیزاد پێغەمبەری خودایە،
- بەختەوەر ئەو کەسەیە، تەماشای خۆی بکات، پەند لەدوێنێ وەرگری، بۆ گۆڕ خۆی ئامادە بکا، لەکاتی قسەکرد ن و لەکاتی بێ دەنگی بەردەوام چاودێری خودای لەیادە،
- چاو چنۆکی سەر شۆڕییە، تەماع ڕیسواییە، پیسکەیی و ڕەزیلی هیچ و پووچیە، ترسان بێ بەش بوونە، بێ ئاگایی لەخودای پەروەردگار کۆسپ و بەربەستە،
- کاتی خۆشگوزەرانی خۆت بۆکاتی لێ قەومان و کارەسات ئامادەبکە، پارەو سامان بۆ خزمەتی خۆت دابنێ، تەمەنت بۆ گوێڕایەڵی خودای پەروەردگار تەرخان بکە،
- لەوانەیە ڕابواردنێك خەم و خەفەتێك، کەوتنێك ڕیسواییەك، پێکەنینێك گریان بهێنێت، گوناح و تاوانیش نیعمەت ناهێڵێت،
- (فەرمانەکانی خودای گەورە بپارێزە، دەت پارێزێت و پاڕانەوەکانت گیرا دەکات، لەکاتی خۆشی خودا بناسە، لەکاتی تەنگانە بەفریات دەکەوێت، ئەگەر دوعات کردو داوای یارمەتیت کرد، تەنیا لەخودا داوابکە) ئەم فەرموودەیە



www.iqra.ahlamontada.com

ئەحمەد گێڕایتیەوە،

- نیعمەتەکانی خودای پەروەدگار، ئەگەر سوپاسی لەسەر بکرێت دەمێنێتەوە، ئەگەر نا ڕادەکا، دونیا ئەگەر کامەرانت بکا، دڵت تەنگ دەکا، دونیا ئەگەر خۆش بوو، هەڵت دەخەڵەتێنێ،
- ساغی و سەلامەتی، یەکێکە لەبەخششەکانی پەروەردگار، تەندروستی مرۆڤ بەکەم خواردن پەیوەستە، سەلامەتی ڕوح بەکەمی گوناحەوە بەندە، شادمانی بە دووری لەتووڕەیی و بوغزی خەڵك بەندە،
- یەك خولەك ئەشکەنجەو ئازار ڕۆژێکە،
- یەك ڕۆژ خۆشی شادی خولەکێکە،
- شەوی کامەرانی زۆر کورتە،
- ڕۆژی خەم و خەفەت درێژەو سەختە،
- کوێرەوەری، نیعمەتەکانی خودای دلۆڤان دەهێنێتە پێش چاو
- برسیەتی، خۆراك خۆشەویست و بەڕێزو مەزن دەکات،
- بەندیخانە، ئازادی پیرۆز و سەنگین و بەنرخ دەکات،
- نەخۆشی، تۆ بۆلەشساغی و تەندروستی بەپەرۆش دەکات،
- سێ پزیشك بگرە : پێکەنین و دڵشادی، پشوو و ئیسراحەت، کەم خۆری.
- لەسێ دوژمن دووربە : بەدبینیی، وەهم، بێ ئومێدی،




www.iqra.ahlamontada.com

- کامەرانی مرۆڤ گەیشتنە بە چڵەپۆپە،
- بردنەوەی، گەیشتنە بە ئاکامی ماندی بوون،
- بەختی ئەوەیە دونیا خزمەتی بکا،
- کاتی سەحەر دەستت بۆخودای میهرەبان پان بکەوە و بپاڕێوە و بڵـێ ئـەی پایـە بـەرزو مـەزن، هەرچـەندە کاڵایـەکی خراپمـان هێناوە، بەڵام لەبەرامبەری دا زۆرمان پێ ببەخشە،
- لەبەخششەکانی خودایە، دووربوون لەنەخۆشی و ئازارو پیری.
- هەتا تێنووت نەبێ ئاو مەخۆرەوە، هەتا برسیت نەبێ خـواردن مەخۆ، کەی خەو ڕووی تێکردی بخەوە،
- ئــەوەی ســەبری گــرت، بــەئامانج دەگــا، ئــەوەی هــەوڵی داو &&مانــدووبوو، ســەرفرازو دڵخــۆش دەبێــت، پەلــەکردن نەزۆکییە، بێ هەوڵدان، تەنیا بە ئومێد مایە پووچییە،
- بەکردەوەکانی خـودا ڕازی بـە، هیـواو ئـاواتی گـۆڕانی مـەخوازە، چونکە ئەو لەتۆ چاکتر دەزانی، بۆتـۆ چ باشـە، لـەدایکی خۆشـت بەبەزەییترە،
- قـەزاو قـەدەری خـودا هـەمووی باشـە، هـەتا گونـاحیش،، بـەو مەرجەی پەشیمانیو تەوبەو پاڕانەوەی لەگەڵ بێـت، خۆبـە زل زانی و لووت بەرزی و لەخۆڕازی بوون ناهێڵێ،
- بەردەوام داوای لێخۆش بوون بکە، ڕەحمەتی خـودا بەشـەوو بـە


www.iqra.ahlamontada.com

ڕۆژ دابەش دەکرێت، بەڵکو پاڕانەوەت گیرابێت و تا ڕۆژی دوایی بەختەوەر بیت،

- دەستخۆشـی و ئافـەرین، بۆئـەو کەسـەی، ئەگـەر بەخششـی دەستکەوت، سوپاسی خودابکا، ئەگەر بەکارە سات تاقی کرایەوە، سەبرو ئـارامی لەسـەر بگـرێ، ئەگـەر گونـاحی کـرد تەوبـە بکـا، لـەکاتی تـووڕەیی ڕەفتـاری نـەرم بێـت، ئەگـەر کاربەدەسـت بـوو جیاوازی نەکا،
- سـوودەکانی خوێنـدنـەوە : زمـان پـاراوی، گەشەسـەندنی ئـەقڵ، ڕۆشنبیری، خاوێنکردنەوەی دەروون، لابـردنـی خـەم و خەفـەت، سـوود وەرگـرتن لەوانـەکانی پێشـوو، بەدەسـتهێنانی هـەموو شتێکی چاك.
- توێشـووی دڵ، دڵسـۆزی، تەوبـە، گەڕانـەوە پـەنای خـودا، پشـت بەخودا بەستن، چاوەڕێی پاداشـتەکانی، ترسـان لەسـزای، ئینجا خۆشویستنی.
- بەردەوام بڵێ ((یاذا الجلال والاکـرام)) و ((یـاحي یـاقیوم برحمتـك أستغیث)) گوشادی و خۆشی و ئارامیت چنگ دەکەوێ،
- ئەگـەر ئـازارت پـێ گەیشـت، بیرلەقـەزاو قەدەربکـەوە، خێـری لێخۆشـبوون، پاداشـی سـەبرە، ئـەو سـتەمکارە، تۆسـتەملێکراو، کەواتە تۆلەئەو باشتری،



www.iqra.ahlamontada.com

- هەرچی نووسراوە دەبێ ببێ، قەزاو قەدەر دانراوە، مەرەکەبی قەڵەمی قودرەت وشك بووە، نەخۆشی و هەژاری و کارەسات و ناخۆشی پاداشتی بۆتۆ هەیە، کەواتە خەمی بۆچییە ؟
- ئەو کەسەی لەدونیا نەچێتە بەهەشتی یادو گوێڕایەڵی و خۆشەویستی وهۆگری خودای پەروەردگار، ڕۆژی دوایی ناچێتە بەهەشت،
- بەگوێڕایەڵی فەرمانەکانی و دوورکەوتنەوە لەقەدەغەکراوەکان، خودای پەروەردگار لێیان ڕازی بوو، ئەوانیش لەخودا ڕازی بوون، بەهۆی هەرچییەکیان دەویست دای پێیان، لەترسیش ڕزگاری کردن،
- چۆن غەمگین دەبێ، ئەو کەسەی خودایەکی هەبێت، ببینێ و ببیسێ وقەزاو قەدەری بەدەست بێت، پەناگەو ڕۆزی و هەموو شتێکی بەدەست بێت،
- بەزەییەکەی فراوانە، دەرگا کراوەیە، بەردەوام بەخششەکانی بەسەر خەڵکدا دەبارێ، میهرەبانەو لێخۆشبوونی هەیە، تەوبە کردنیش وەر دەگیرێ،
- هەرگیز نیگەران مەبە، چونکە قەزاو قەدەر دانراوە، مەرەکەبەکەی وشك بووەوە، تێنووس هەلگیراوە، پەروەردگار لەگوناحو تاوان خۆش دەبێت و پاداشتی چاکەش دەداتەوە،


www.iqra.ahlamontada.com

- بەچاکی کاربکە، ئومێدت زۆر بەم دونیایە نەبێت، مەرگت لەپێشە، خەریکی کارو کردەوەکانت و ئاگاداری دەوروبەرت بە، زمانت بپارێزە،
- بۆ ئادەمیزاد لەکتێب بەکەڵکترنییە، لەقەبر کاریگەرتر نییە، لەگوناح‌و تاوان خراپتر نییە، لەوازهێنان لەدونیا بەرێزتر نییە، لەچاو تێرو بەقەناعەت دەوڵەمەند تر نییە،
- تەمری نەك بەهەرەمەکی، بەڵکو بەهەوڵ و خەبات و قوربانی دەدرێ، بەگوێرەی ماندووبوون و کۆشش، ناوت لەمێژوو دەنووسرێ،
- هەمووکارێك بەئاسان بزانە، ئاسان دەبێت، بیرلەدوای مردنت بکەوە و خەمێکی بخۆ، واز لە زیادە ڕۆیی بێنە،
- هۆکاری خەم و خەفەت، زیادە ڕۆییە لەحەڵاڵەکان : قسە، خواردن، خەوتن، تێکەڵاویی، پێکەنین،،.....
- ﴿لِكَيْلاَ تَأْسَوْا عَلَى مَا فَاتَكُمْ وَلاَ تَفْرَحُوا بِمَا آتَاكُمْ وَاللَّهُ لاَ يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ﴾الحديد/٢٣، (بۆئەوەی خەفەت نەخۆن بۆئەوەی لەکیستان چووە) (ت، ئاسان)
- کەواتە خەمو پەشیمانی ناوێت، بەگریان و قیژەو هاوار خۆتان مەفەوتێنن،
- ﴿يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ حَسْبُكَ اللَّهُ وَمَنْ اتَّبَعَكَ مِنْ الْمُؤْمِنِينَ﴾الانفال/٦٤.



www.iqra.ahlamontada.com

واتــە : تــەنیا خــوا بەســە بۆخــۆت و ئەوانــەی شــوێنت کــەوتوون)
(ت: ئاسان)

- خــودا پشــتیوانی و چــاودێری و بــەرگریتان لــێ دەکــات و دەتانپارێزێ، کەواتە هەرگیز مەترسن،
- ﴿إِنَّ اللَّهَ مَعَ الَّذِينَ اتَّقَوْا وَالَّذِينَ هُمْ مُحْسِنُونَ﴾ النحل/١٢٨.

واتــە : چونکە بەڕاستی خـوا لەگـەڵ ئـەو کەسانەدایە کـە خۆیـان پاراســتووە لــەگوناح و هــەروەها ئەوانــەش کــە چــاکەکارو چـــــــــــــــــــاکەخوازن.
(ت: ئاسان)

- لەبەلای ناگەهان دەیانپارێزێ، لەکاتی نەخۆشی شیفایان دەدات، لەتەنگ و چەڵەمەو شەڕو ئاژاوە دەیانپارێزێ،
- ﴿لاَ تَحْزَنْ إِنَّ اللّهَ مَعَنَا﴾ التوبة/٤٠.

واتە : خەفەت مەخۆ، دڵنیابە خوامان لەگەڵە.

- دەمــانبینی، گوێبســتی قســەکانمانە ن بەســەر دوژمــن ســەرمان دەخــا، پێویســتیەکانمان بــۆ ئاســان دەکــات، خــەم و پــەژارەمان ناهێڵێ،
- ﴿أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ﴾ الشرح/١.

واتــە : ئــەی موحەمــەد، ئایــە دڵ و دەروون و ســینەتان گوشــاد و



www.iqra.ahlamontada.com

ئاسوودە نەکردیت ؟!

ئایە دەروونی ئێوەمان شادو هێمن و فراوان و گوشاد نەکردووە؟!

- ﴿وَلاَ تَكُ فِي ضَيْقٍ مِّمَّا يَمْكُرُونَ﴾ النحل/١٢٧.

واتە : (ئەی پێغەمبەر ﷺ، ئەی ئیماندار)، خۆگر و ئارامگربەو خۆگری و ئارامگریەگشت تەنها بەکۆمەکی و یارمەتی خوا دەبێت بەکەسی تر ناکرێت، خەفەتیش مەخۆ لەخوا نەناسان کەباوەڕ ناهێنن دڵتەنگ مەبە لەبەرامبەر ئەو پیلان و نەخشانەی کەدوژمنان دەیگێڕن.

- مەترسە، مەشلەژێ، پەرێشان مەبە، ئێمە لەفرت و فێڵیان، بەرگریت لێ دەکەین و دەتپارێزین،

- ﴿وَلاَ تَهِنُوا وَلاَ تَحْزَنُوا وَأَنتُمُ الأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ آل عمران/١٣٩

واتە : ئەی ئیمانداران، کۆڵ مەدەن و سارد مەبنەوەوخەفەت مەخۆن، چونکە هەر ئێوە سەربەرزو سەرفرازو سەر کەوتووترن ئەگەر ئیمانداری چاك و ڕاست و دروست بن. (ت: ئاسان)

- چونکە ئێوە لەباوەڕو پەیڕەوو پرۆگرام و خووڕەوشت و هەڵسوکەوت بەرزترن،

- ﴿إِنَّ رَبَّكَ وَاسِعُ الْمَغْفِرَةِ﴾ النجم/٣٢



www.iqra.ahlamontada.com

واتە : بەڕاستی پەروەردگاری تۆ ئەی پێغەمبەر، ئەی ئیماندار، چاوپۆشی زۆر فراوانە (ت: ئاسان)

- لەتاوانبار خۆش دەبێ، لەهەڵە دەبوورێ، گوناح دادەپۆشێ، چەوتی دەسڕێتەوە، ئەو کەسەی تەوبە بکاو بگەڕێتەوە لێی قبوڵ دەکاو وەری دەگرێتەوە،
- ﴿وَلاَ تَيْأَسُواْ مِن رَّوْحِ اللّهِ إِنَّهُ لاَ يَيْأَسُ مِن رَّوْحِ اللّهِ إِلاَّ الْقَوْمُ الْكَافِرُونَ﴾ يوسف /٨٧

واتە : لەسۆزو میهرەبانی خواییش نائومێد مەبن. (ت:ئاسان)

- چونکە خێرا فریای لێ قەو ماوان دەکەوێ، بۆگشت خەڵك بەخشندەیە، کاری هەموان ئاسان دەکات،
- ﴿وَهُوَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ﴾ يوسف/٦٤

واتە : هەرئەو میهرەبانترینی میهرەبانانە. (ت:ئاسان)

- شیفای نەخۆش دەدات، تەندروستی و لەشساغی بەدەستە، پارێزەرە، پشتیوانە، داپۆشەری گوناحە، لەتاوان خۆش دەبی، میهرەبانە، چاکەی بێ ژمارەیە،
- ﴿قَالَ هَلْ آمَنُكُمْ عَلَيْهِ إِلاَّ كَمَا أَمِنتُكُمْ عَلَى أَخِيهِ مِن قَبْلُ فَاللّهُ خَيْرٌ حَافِظاً وَهُوَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ﴾ يوسف/٦٤

واتە:خواچاکترین پارێزەرە (ت:ئاسان).



www.iqra.ahlamontada.com

- لانەواز دەپارێزی، نامۆ دەگەڕێنێتەوە، ڕێ بۆ گومڕابوو نیشان دەدا، بەڵاو کارەسات لەسەر خەڵك لادەبا، شیفای نەخۆش دەدا، خەم ناهێڵێ،
- ﴿وَعَلَى اللّهِ فَتَوَكَّلُواْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ المائده/٢٣

واتە : بەتەواوی پشت بەخوا ببەستن، ئەگەر ئێوە ئیماندارن. (ت:ئاسان)

- کارەکانتان بەخودا بسپێرن، بۆ ئەو بیگەڕێننەوە، تەنیا داوا لەئەو بکەن، بەدابەشکردنی خودا ڕازی بن، بەچاودێری ئەو دڵنیابن.
- ﴿فَعَسَى اللّهُ أَن يَأْتِيَ بِالْفَتْحِ﴾ المائدة/٥٢

واتە : لەوانەیە بەدوور نییە، بەم نزیکانە خواسەر کەوتن ببەخشێت. (ت:ئاسان)

- دەرگا کلۆم دراوەکان دەکاتەوە، بەڵای ناگەهان لادەبات، شەوە تاریك و درێژەکان ناهێڵێ، دڵ ئاسوودەو ڕەوشەکە چاك دەکا،
- ﴿ لَا تَدْرِي لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَلِكَ أَمْراً﴾ الطلاق/١

واتە : تۆنازانیت لەوانەیە خوای گەورە دوای ئەوە بارودۆخێك پێشبهێنێت. (ت:ئاسان)

- خەم و پەرێشانی و دڵتەنگی ناهێڵێ، کارەکان ئاسان دەکات،
- ﴿كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِي شَأْنٍ﴾ الرحمن/٢٩


www.iqra.ahlamontada.com

واتــە : پــەروەردگار هــەمووڕۆژێك بــێ ژمــارە تــاو تــوێ دەكــات لەجیهانی ئادەمیزادو پەری فریشتەكان،.... هتد (ت : ئاسان)

- خـەم و نیگـەرانی لادەبـا، لـەگوناحو تـاوان خـۆش دەبـێ، ڕۆزیـی دابەش دەكا، شیفای نەخۆش دەدا، لێ قـەوماو ڕزگـار دەكـا، دیـل ئازاد دەكا، دڵ بریندار تیمار دەكا،
- ﴿فَإِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْراً﴾ الشرح/٥

واتــە : بەڕاســتی لەگــەڵ تەنگانــەدا خۆشــی و ئاســوودەیی دێــت. (ت : ئاسان)

- دوای هـەژاری دەوڵەمەنــدی، دوای نـەخۆشــی تەنـدروسـتـی، دوای خـەم و خەفـەت كامـەرانی دوای ناخۆشـی خۆشـی، دوای بەنـدی ئازادی، دوای برسیەتی تێربوون هەیە،
- ﴿سَيَجْعَلُ اللَّهُ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْراً﴾(الطلاق: ٧)
- واتە : دڵنیابن كە خـوا دوای تەنگانـە هـەرزانی دەهێنێـت، دوای ناخۆشی، خۆشی دەهێنێت (ت : ئاسان)
- كـۆت و زنجـیرو پــەت دەپســێ، دەرگاكــان دەكرێنــەوە، بــارانی ڕەحمەتی بەسەرتا دەبـارێ، دوورو دەربـەدەر دەگەڕێتـەوە، بـارو ڕەوشەكە باش دەبێت،
- ﴿فَصَبْرٌ جَمِيلٌ﴾(يوسف : ١٨)



www.iqra.ahlamontada.com

- واتە : خۆگری و ئارام گرتن لەجوانترین شێوە. (ت: ئاسان)
- بارەکە دەگۆڕێ، دەروون ئارام دەبێت، دڵەکان شاد دەبێت، کارەکان ئاسان دەبن، گرێ کوێرەکان دەکرێنەوە، تەنگو چەڵەمە نامێنێت،
- ﴿وَتَوَكَّلْ عَلَى الْحَيِّ الَّذِي لَا يَمُوتُ﴾ (الفرقان : ٥٨)

واتە : پشت ببەستە بەو زاتەی کە هەمیشە زیندووەو هەرگیز نامرێت. (ت: ئاسان)

- بۆئەوەی کارو بارت چاك بکا، دڵت شاد بکا، سامانت بپارێزی، سەرپەرشتی منداڵەکانت بکا، لەدوا ڕۆژ پایە بەرزت بکا، هیواو ئاواتت جێبەجێ بکا،
- ﴿حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾ (ال عمران : ١٧٣)

واتە : خوامان بەسە کەیاریدەدەرو یارمەتیدەرێکی چاکە (ت : ئاسان)

- خەم و کیرو گرفت ناهێڵێ، لەگوناهەکانمان خۆش دەبێت، دڵەکانمان چاك دەکات، کەم و کوڕیمان لەسەر هەڵدەگرێ،
- ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحاً مُّبِيناً﴾ (الفتح ١:)

واتە : ئەی پێغەمبەر، بەڕاستی ئێمە سەرکەوتنێکی ئاشکرامان پێ بەخشیت (ت: ئاسان)

- ڕێنماییمان کردی، هەڵمان بژاردی، تۆمان پاراست، تواناو


www.iqra.ahlamontada.com

دەرفـەتمان پـێ بەخشـی، سـەرمان خسـتی، گـەورەمان کـردی، تاقیمان کردییەوە،

- ﴿وَاللّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ﴾ (المائدە : ٦٧)

واتـە : دڵنیـاش بـە کـە خـوا، لەخراپـەی خـەڵکی دەتپارێزێـت (ت: ئاسان)

- دوژمن دەستی ناتگاتێ، ستەمت لێ ناکرێ، ئیرەییت پـێ نـابرێ، قین لە دڵ بەسەرتدا زاڵ نابێت.
- ﴿وَكَانَ فَضْلُ اللّهِ عَلَيْكَ عَظِيماً﴾ (النساء : ١١٣)
- واتە : بەردەوام فـەزڵ و ڕێـزی خـوا لـە سـەرتۆ ئـەی موحەمـەد زۆر فراوان و ئاشکراو دیارە (ت:ئاسان)
- دروستی کردی، ڕۆزیی دای، زانستی فێرکـردی و تێـی گەیانـدی، پشتیوان و ڕێنمایی کـردی، خورەوشـتی جـوانی فێرکـردی، تـۆی چاودێری کرد و تۆی پاراست و سەرکەوتووی کردی،
- ﴿وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ فَمِنَ اللّهِ﴾ (النحل: ٥٣)
- واتـە : هەرچـی نـازو نیعمـەتێکتان هەیـە، هـەمووی بـەهرەو بەخششی خودایە (ت: ئاسان)
- ژیـان، ڕۆزیـی، بیـنین و بیسـتن، هیدایـەت و تەندروسـتی، ئـاوو هەوا، دەرمان و جلو بەرگ و خانوو،
- یارمەتی و پشتگیری و بـەزەیی و بەخشـش و سـەرفرازی، تـەنیا



www.iqra.ahlamontada.com

لەخودا داوابکە،

- ئەوکەسەی لای خودا بگریٚ، خودا سەری دەخا، بەرزی و پلەو پایەی پیٚ دەبەخشی، دوژمنەکانی سەر شۆڕ دەکا، ئەو کەسەی فیٚڵی لیٚبکات شەرمەزاری دەکا،
- (لا حول و لا قوە الا باللە) توانا، ئیرادە، پشتیوانی، سەرکەوتن، دەرفەت، بیٚ کەمو کوڕی، هیٚز، هەمووی تەنیا بەیارمەتی خودایە،

- ﴿أَلَمْ نَجْعَل لَّهُ عَيْنَيْنِ﴾(البلد: ٨)

واتە : ئایە جووتیٚك چاومان پیٚنەبەخشیوە. (ت:ئاسانە)

- بەم چاوانە تەمەشاو سەرنجی گەردوون و جوانییەکانی ئەم ئاهەنگەی ژیانە بدات،
- ﴿وَلِسَاناً وَشَفَتَيْنِ﴾ (البلد: ٩)

واتە : ئایە زمان و دوولیٚویشمان پیٚ نەبەخشیوە. (ت:ئاسان)

- بەقسەی خۆش و جوان سەرنج ڕاکیٚش بەکاری بهیٚنە،
- ﴿لَئِن شَكَرْتُمْ لأَزِيدَنَّكُمْ﴾ (ابراهیم: ٧)

واتە : ئەگەر سوپاسگوزارو شوکرانە بژیٚربن ڕزق و ڕۆزیو نازو نیعمەتتان بەسەر دادەڕژیٚنم و زیادی دەکەم (ت:ئاسان)

- ئەگەر سوپاسگوزاربن، زانست و تیٚگەیشتن و ڕۆزیشتان زۆر تر


www.iqra.ahlamontada.com

دەبێت،

- ﴿وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُ﴾ (لقمان :٢٠)
- واتە : بەفراوانی نازو نیعمەتی بەسەر دا ڕژاندووون (ت:ئاسان)
- هەموو بەخششێکی ئاشکراو نادیار، گشتی و تایبەتی، لەدونیاو لەدواڕۆژ، لەسامان و کەس و کار، لەکارزانایی و زیرەکی، لەگیان و ڕۆح پێداون،
- ﴿وَأُفَوِّضُ أَمْرِي إِلَى اللَّهِ﴾ (غافر: ٤٤)

واتە : من خۆم و کاروبارەکانم، دەدەمە دەست خوای گەورەو پشت بەو دەبەستم. (ت:ئاسان)

- سکاڵام بۆی بەرز دەکەمەوە، باسی خۆم و کێشەکانم دەکەم، نیەت و بۆچوون و دانانم باش دەکەم، پشتی پێ دەبەستم، بەکارو کردەوەکانی ڕازیمە، دڵنیام لەتوانای،
- ﴿اللَّهُ لَطِيفٌ بِعِبَادِهِ﴾ (الشوری : ١٩)

واتە : خوای گەورە زۆر بەسۆزو دلۆڤانە لەگەڵ بەندەکانیدا. (ت: ئاسان)

- لەکاتی هەژاری ڕۆزییان دەدات، لەکاتی تەنگانە فریایان دەکەوێت، ئەگەر داوای لێخۆشبوون بکەن، لێیان دەبوورێت، ئەگەر نەخۆش بکەون شیفاو چارە سەریان دەکات، لەبەڵاو کارەسات ڕزگاریان دەکات.



www.iqra.ahlamontada.com

- ﴿لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللهِ﴾ (الزمر ٥٣)

واته : نائومێد مەبن لەڕەحمەتی خوا. (ت: ئاسان)

- دەرگای هەمیشە کراوەیە، پەردە لەنێوان خوای و بەندەکانی نییە، گەنجینەی هەرگیز خاڵی نابێت، چاکەی قەت نابڕێ، پەیوەندی و توانای بەردەوام ئامادەیە،
- ﴿أَلَيْسَ اللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُ﴾ (الزمر:٣٦)

واته: مەگەر خوا بەس نییە، کە پشتیوان بێت، بۆبەندەی خۆی کە پێغەمبەرە (ت: ئاسان)

- لەخەم و خەفەت، لەفێڵی، خراپەکارو هەموو ناخۆشی دەیپارێزی،
- ﴿ابْتَغُوا عِندَ اللَّهِ الرِّزْقَ﴾ (العنكبوت: ١٧)

واته : کەواتە هەر داوای ڕزق و ڕۆزی لەخوا بکەن. (ت:ئاسان)

- گەنجینەی زۆر پڕی هەیە، خێرو چاکە تەنیا بەدەست خودایە هەرخۆی جوامێرەو لەبەخشین بێ هاوتایە، زاناو ئاگادارە،
- ﴿وَمَن يُؤْمِن بِاللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُ﴾ (التغابن : ١١)

واته : ئەوەی باوەوڕی تەواو بهێنێت، خوا دڵی ڕێنموویی دەکات بۆ لای خۆی (ت: ئاسان)

- خەم و پەژارەی لادەبا، لەگوناهەکانی خۆش دەبێت، ڕق و قینی ناهێڵی، ڕێگای ڕۆشن دەکاتەوە، پشتیوانی دەکات،



www.iqra.ahlamontada.com

- ﴿اذْكُرُواْ نِعْمَتَ اللّهِ عَلَيْكُمْ﴾ (المائده : ١١)

واتە : یادی نازو نیعمەتی خوابکەنەوە لەسەرتان. (ت: ئاسان)

- ئێوەی لەنەبوونەوە هێنابوون، گومڕابوون، ڕێنمایی کردن، هەژاربوون، دەوڵەمەندی کردن، نەزان بوون، زانستی فێرکردن، بێ دەسەڵات و بێ هێزبوون، بەسەر خستن،
- چەندین جاران، داوات کرد بۆی جێبەجێکردی، کەوتی هەڵی ساندییەوە، تووشی تەنگو چەڵەمە بووی کار ئاسانی بۆکردی، دوعات کرد بۆی گیراکردی،
- سڵاوو دروود لەگیانی پێغەمبەر، خەم و پەژارە لادەبات، دڵی بریندار تیمار دەکات، دەرگای زانین والادەکات، ڕۆزی دەهێنێتە بەر دەست،
- ﴿ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ﴾ (غافر: ٦٠)

واتە : ئێوە هاناو هاوار بۆمن بهێنن، ئەوەمن دوعاو نزاتان گیرا دەکەم (ت : ئاسان)

- دەستتان بەرزبکەنەوە، بپاڕێنەوە، داواکارییەکانتان و ڕۆزی هەموو پێویستیەکتان و سکاڵای دڵی خۆتان بە پەروەردگار ڕابگەیەنن.
- ﴿أَمَّن يُجِيبُ الْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ﴾ (النمل ئایەتی : ٦٢)

واتە : ئایە کێیە جگە لەزاتی پەروەدگار، کەبێت بەهاناو هاواری



www.iqra.ahlamontada.com

لێقـەوماو و بـێ دەرەتـان و بـێ داڵـدەوە، پـەژارەو پەرێشـانی و کارەساتی لەسەر لادەبات، ئومێدی و مرازی جێبەجێ دەکات،

- گـەردنی ئـەو کەسـانەی جنێـوو ئازاریـان دای ئـازاد بکـەو لێـان خۆش بە لای خودای پەروەردگار قەرەبوو پاداشت هەیە،
- کەشتیوان بترسێ، دەڵێ یا الله، رێ ون بوو دەڵێ یا الله، زینـدانی دەڵێ یا الله، نەخۆش دەڵێ یا الله،
- ﴿اللَّهُ الصَّمَدُ﴾ (الاخلاص:٢)

واتـە : خـوا زاتێکـی پایـەدارو دەسـەڵاتدارە، نیـازی بەکـەس نییـەو هـەمووان ئاتـاجی ئـەون، هەرئـەو دەتوانێـت بـەلاو ناخۆشـی لابـەرێت و پێویسـتی و داخوازییـەکانمان جێبـەجێ بکـات (ت: ئاسان)

- هەرچی زیندەوەر و گیانلەبەر و رۆح لە بـەرە، بەهـەموو جـۆرە زمانێك هانای بۆ دەبەن و پێویستیان پێ هەیە.
- ﴿ذَلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ مَوْلَى الَّذِينَ آمَنُوا﴾(محمد : ١١)
- واتە : ئەوەبە هۆی ئەوەوەیـە، چـونکە بەراسـتی خـوا پشـتگیر و پشتیوانی ئەوانەیە کە ئیمان و باوەڕیان هێناوە (ت:ئاسان)
- ڕێگای هیدایەت ڕۆشـن و ئاسـان دەکـا، گلـەیی و پرسـیارەکانیان بـۆڕوون دەکاتـەوە، لـەگومڕایی و سـەر لێشـێواوی دەیانپـارێزی زانیارییان پێ دەبەخشێت.


www.iqra.ahlamontada.com

- ئەی خەڵکینە، لەگەڵ ئافرەتان نەرم و لەسەر خۆبن، وەکو شووشە ناسکن، لەگەڵ خەڵك بەبەزەیی و هێواش و بەرەفتاری جوان، هەڵسوکەوتی چاکیان لەگەڵ بکەن.
- توورەییت قووت بدەوە و لەهەڵە ببوورە و پشت گوێی خە، گوێ مەدەرە خراپەکانی خەڵك، کەم و کورییان داپۆشە، دەبیت بەخۆشەویسترین کەس.
- ژورێکی تەندروست و دڵێکی ئاسوودەو بەتەقواو باشت هەبێت، بەهیواو ئاوات دەگەی.
- زیادەڕەوی سوودی نییە، هەرچیت لەپێویستی خۆت زیاترت هەبێت، بارگرانییە، داوێن پاکی وهەژاری باشترە لە ڕابواردن و زێدە مەسرەف.
- پیلا نگێڕمەبە، چاو دێری کەس مەکە، وامەزانە خەڵکی بیرلەتۆو خەمی تۆیانە، هەرکەس خەریکی ئیش و کاری خۆیەتی،
- ﴿فَسَيَكْفِيكَهُمُ اللَّهُ﴾ (البقره: ١٣٧)

واتە : (بەلام دڵنیابە ئەی محەمەد، ئەی ئیماندار) خوا تۆدەپارێزێت لە پیلان و تەڵەکەیان (ت: ئاسان)

- فێڵیان پووچەڵ دەکاتەوە، پیلانیان لەناو دەبا، سەربازەکانیان سەر شۆڕ دەکا، توندییان نەرم دەکاتەوە، هێزو توانایان ناهێڵێ،



www.iqra.ahlamontada.com

تەفرو تونایان دەکات،

- ﴿فَأَنزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ﴾ (الفتح : ١٨)

واتە : ئارامی و هێمنی و ئاسوودەیی دابەزاند سەریان. (ت: ئاسان)

- بەمرازیان دەگەیەنێت، شیفای نەخۆشەکانیان دەدات، دەروونی پڕ ئازاریان هێور دەکاتەوە، ویژدانیان ئاسوودەدەکا، دڵیان خاوێن دەکاتەوە.
- (الکلمة الطیبة صدقة) ئەم فەرموودە یە ئیمامی بوخاری و موسلیم و ئەحمەد گێڕاییانەوە،

واتە : قسەی خۆش خێرو چاکەیە،

- دڵی خەڵك خۆش دەکات، دەروون دەکاتەوە، برین سارێژدەکات، تووڕەیی و قین ناهێڵێت، ئارامی بەخشە،
- (تبسمك في وجه أخيك صدقة) ئیمامی تورمزی گێڕایتیەوە،
- واتە : زەردەخەنە بەرامبەر برادەر خێرو چاکەیە،
- چۆن بەناو نیشانی کتێب، ناوەڕۆکی دەزانین، ڕوخسار ئاوێنەی دڵە، نەرمی و ویژدان سەرەتای خۆش بەختییە.
- ﴿ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾ (المؤمنون: ٩٦)
- واتە : بەچاکترین وجوانترین شێوە هەوڵ بدە (ت: ئاسان)
- بەوازهێنان لەتوڵەسەندنەوە، بەنەرمی لەگفتو گۆ، بەهەڵسوکەوت و ڕەفتاری جوان و لەبیرکردنی خراپە،



www.iqra.ahlamontada.com

- ﴿مَا أَنزَلْنَا عَلَيْكَ الْقُرْآنَ لِتَشْقَى﴾ طـه/٢

واتـە :پێغەمبـەر ئێمـە ئـەو قورئانـەمان دانەبەزانـدووە بەسـەرتۆ تاتووشی خەفەت و غەم و پەژارە ببیت (ت:ئاسان

- بــەڵكو بۆبەختــەوەری تــۆ وئاســوودەیی ئــارامی و چــوونت بۆبەهەشتی فیردەوس،

- ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ﴾ الحج /٧٨.

واتە : لەو ئایین و بەرنامە یە هیچ جۆرە شتێکی نـارەوا و قـورس و گرانی لەسەر دانەناون (ت: ئاسان)

- ﴿وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالأَغْلاَلَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ﴾ الاعراف/١٥٧

واتـە : ئەرکـە قـورس و سـەنگینەکان لەسەرشـانیان لادەبـات، ئـەو کۆت و زنجیرانەش کەلە سەریان بوو لای دەبات (ت : ئاسان)

- دوای ئــەو هــەموو ڕەنجــە ڕۆییــە، دڵخـۆش و کامــەران دەبــن و دەحەسێنەوە، دوای ئەو خەمانە بێ ترس و دڵشاد دەبن،

- ﴿قَالَ رَبِّ اشْرَحْ لِي صَدْرِي * وَيَسِّرْ لِي أَمْرِي﴾ طـه/(٢٦-٢٥)

- واتــە موســا (د.خ) گــوتی : پــەروەردگارا ســینەو دڵ و دەروونم ئاسوودەو گوشاد بکە، ئـیش و کـارو هـەوڵ و کۆششـم بـۆ ئاسـان بکە (ت: ئاسان)

- تا ئەو نوورە ببینم، هەست بەهیدایەت بکـەم، ڕێڕەوەکـە بگـرم، لەتاقی کردنەوەی ژیان دەربچم، لەدوا ڕۆژ سەرفرازبم،



www.iqra.ahlamontada.com

- ﴿وَنُيَسِّرُكَ لِلْيُسْرَى﴾ الاعلى/٨
- واتە : دڵنیابە ئێمە، یارمەتیت دەدەین بۆئەنجام دانی هەموو چاكەیەك، هەموو كارێكی لەبارت بۆ ئاسان دەكەین (ت:ئاسان)
- تاوەكو خودا پەرستیت بە خۆشەویستیەوە بێت، لەفرمانی دەرنەچیت، لەپێناوی خەبات بكەی، ئازاری خۆش بیت، گوژاڵكی تاڵی ببێتە هەنگوین،
- ﴿لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْساً إِلاَّ وُسْعَهَا﴾ البقرة/٢٨٦

واتە خوای گەورە ئەرك ناخاتە سەر هیچ كەسێك، مەگەر بەقەدەر توانای خۆی نەبێت (ت: ئاسان)

- ئەرك و فەرمانی خودا لەتوانای مرۆڤ زیاتر نییە، بەڵكو بەگوێرەی هێزو زانین و توانایە،
- ﴿رَبَّنَا لاَ تُؤَاخِذْنَا إِن نَّسِينَا﴾ البقرة/٢٨٦

واتە: پەروەردگارا : لێمان مەگرە، ئەگەر فەرامۆشیمان بەسەر داهات (ت: ئاسان)

- چونكە كەم هەوڵدەدەین، بێ ئاگاینە، شت فەرامۆش دەكەین، تووشی لەبیرچوونەوە دەبین سەر مان سووڕدەمێنێ، خوای پەروەردگار، داوای لێبوردن دەكەین،
- ﴿أَوْ أَخْطَأْنَا رَبَّنَا﴾ البقرة/٢٨٦

واتە : یان گوناحو هەڵەیەكمان لەدەست قەوما (ت: ئاسان)


www.iqra.ahlamontada.com

- خۆئێمە لەگوناح و تاوان مەعسوم نین، گوناحمان زۆرە، بەڵام ئومێدەوارین لەبەخششی تۆ چاومان لە بەزەیی تۆیە،
- ﴿رَبَّنَا وَلاَ تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْراً﴾ البقرة/٢٨٦

واتە : پەروەردگار ئەرکی سەخت و کاری گران مەدەبەسەرماندا لەتواناماندا نەبێت (ت:ئاسان)

- ئێمە بەندەی بێ دەسەڵات و هەژارین، تۆفێرت کردین چۆن لێت بپاڕێینەوە، پاڕانەوەکانمان گیرابکە ،
- ﴿رَبَّنَا وَلاَ تُحَمِّلْنَا مَا لاَ طَاقَةَ لَنَا بِهِ﴾ البقرة/٢٨٦

واتە : تووشی بەڵاو ناخۆشیەکمان مەکە، تواناو هێزو هەناومان لێ ببڕیت (ت:ئاسان)

- نەوەك نەتوانین یا ماندوو بین و دەروونمان بێزاربێت، ئاسانی بکە، هەرچەندە ئاسانیشت کردووە،
- ﴿وَاعْفُ عَنَّا﴾ البقرة/٢٨٦

واتە : گوناحەکانمان بسڕەوە (ت: ئاسان).

- ئێمە هەڵەکارین، خراپە هەرلە ئێمە سەر هەڵ دەدا، کەم و کوڕی شایەنی ئێمە بووە، تۆش بەخشندەو بەزەیی و مهرەبانی،
- ﴿وَاغْفِرْ لَنَا﴾ البقرة/٢٨٦

واتە : چاو پۆشی بکە لەهەڵەو تاوانەکانمان و دای پۆشە. (ت: ئاسان)

لەگوناحەکان خۆش دەبی، خەوش و کەم و کوڕی دادەپۆشی،



www.iqra.ahlamontada.com

هـــەرتۆی لەگـــەڵ کەمتەرخـــەم نـــەرم و بەســـەبری، هـــەر تۆبەخشندەی،

- ﴿وَارْحَمْنَا﴾ البقرة/٢٨٦.

واتە : بەزەییت بێتەوە پیامانداو ڕەحممان پێ بکە (ت: ئاسان)

- بەبـــەزەیی تـــۆ دڵخۆشـــین، ئومێـــدەکانمان دەژییێتـــەوە، خواپەرستیەکانمان وەردەگیرێ، ڕەوش و ژیانمان چاك دەبێت،
- (بعثـت بالحنيفيــة السـمحة)ئیمـام ئەحمـەد ئـەم فـەرموودەی گێڕاوەتەوە،
- واتـە : مـن نێـردراووم بـە ئـایینی حـەزرەتی ابراهیمـی ڕاسـت و میهرەبان،
- ڕکابەری و پـێ داگـرتن و ئـەرك و ئـازارو لەسنوور تێپەڕانـدنی تێدانییە، بەڵکو فیترەت و سونەت و ئاسانکاری و ئابورییە،
- (إياكم والغلو)نەسائی و ئیبن ماجەو ئەحمەد ئەم فەرمووەدیان گێڕاوەتەوە،
- واتە : نەکەن زیادە ڕۆیی بکەن،
- کەواتــە بــە پێــی شــەرع و ســونەت نــەك بیدعــەو داهێنــان ڕەفتارکردن، ئاسـانی و میـانڕەوی نـەك تونـدڕەوی، وەکـو خـۆی نەك زیاد کردن،
- (امـــتي امـــة مرحومـــة) ئیمـــامی ئەحمـــەد ئـــەم فـــەرمووەدەی گێڕاوەتەوە،



www.iqra.ahlamontada.com

- واتە : خودا بەزەیی و ڕەحم بە موسڵمانان دەکا،
- خودا پشتیوانی موسڵمانانە، پێغەمبەر محمد (د.خ) سەردارو گەورەی پێغەمبەرانە، باشترین ئایینی هەیە، چاکترین نەتەوەیە، جوانترین شەریعەت و ڕێسایە،
- (ذاق طعم الايمان، من رضي بالله ربا وبالاسلام دينا و بمحمد رسولا) ئیمامی موسلیم و تەرمزی و ئەحمەد ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە،
- واتە : ئەو کەسەی بەخوداو ئایینی ئیسلام و پێغەمبەرایەتی (محمد) (د.خ) ڕازی بێت، تامی ئیمان و باوەڕدەکا،
- ئەم سێ بنچینەیە، هۆیەکانی ڕەزابوونی خوداو گەیشتن بە ئامانجە لەژیان،
- نەکەی بێزارو قەڵس بیت، چونکە دەرگای خەم و خەفەت و پەرتەوازەی دڵ و دەروون و ڕە وشتی خراپ و هەروەها بە فیرۆدانی تەمەنە،
- ڕەزابوون بە تەقسیمی خودا، بۆدڵی مرۆڤ، ئارامی و ئاسوودەیی و دڵنیایی و ژیانی خۆش و شادمانی دەبەخشێت،
- ئەوکەسەی لەخودا ڕازی بێت، دڵی پڕ نوورو باوەڕو خۆشەویستی و دەوڵەمەندی و دڵنیایی و گەڕانەوە بۆلای ئەوو چاویشی تێردەبێت،
- کاکی هەژار : سەبرت هەبێ، لەئەرکی هەبوونی پارە، هەروەها


www.iqra.ahlamontada.com

خزمـــــەتی ســــامان و کۆکردنـــــەوەو پاراســــتن و ئیجـــــا لێپرســـینەوەیەکی تونــدو دوورو درێــژ لەلایــەن پــەروەردگار ڕزگارت بووە.

- ئـەی ئـەو کەسـەی چـاوەکانت لەدەسـت داوە : بـەهۆی کـوێری، مزگێنـی بەهەشـتت پـێ دراوە، چـاك بزانـە لـەبری ئـەو نورێـك لـەناو دڵـت هەیـە، لەتەمەشـای بـێ شـەرعی و گەمـەو گاڵتـە و بینینی خراپە ڕزگارت بووە،
- ئەی ئەو کەسەی نەخۆشـی : بـەهۆی سـڕینەوەی گونـاحو تـاوان خاوێن بویەوە، دڵت پاك و خاوێن ئاوێنە ئاسایە، دەروونی تـۆی لەخراپە بەدوور خستی، خۆ بەزلزانی و لووتبەرزی نەهێشتی،
- بۆچـــی بـــیر لەنـــەبوو دەکەیـــەوە، سوپاســـی هـــەبوو ناکـــەی، بۆتەمەشای ئەو هەموو ناز و نیعمەتەی هەیە ناکـەی، خـەم بـۆ هیتر دەخۆی، ئیرەیی بەخەڵك دەبەی، ئەوانـەی هـەیتت نـابینی و فەرامۆشی دەکەی،
- (کن فی الدنیا کانك غریب) بوخاری و تورمزی و ئیبن ماجـە و ئەحمەد ئەم فەرموودەیان گێڕا وەتەوە،
- واتە : لەدونیادا وەکو نامۆی بژی،
- پارچـەیەك نـان، قومێـك ئـاو، پۆشـتەیی، ژیـانی چـەند شـەو ڕۆژێکـی دیـاری کـراو، ئـەها! ژیـان تـەواو بـوو، ئینجـا گـۆڕی دەوڵەمەندترین کەس و هەژارترین کەس، وەکو یەکە،



www.iqra.ahlamontada.com

- پاشاو خزمەت کار، سەرۆك و پاسەوان، شاعیری بەناوبانگ و هەژار، دەوڵەمەند و گەدا لەتەنیشت یەکدی لەگۆڕ دەشاردرێنەوە، بەڵام لەناو قەبر کارو کردەوە و پلەو پایە جیاوازە،
- ئەگەر گەیشتیە ڕۆژێکی تازە، پێی بڵێ بەخێرهاتی ئەی میوانی ئازیز، میواندارییەکی چاکی بکە، بەبەجێهێنانی فەرزەکان، ئەرکەکان، نوێکردنەوەی تۆبە، نەکەی بەگوناحو تاوان ڕەشی بکەیتەوە، چونکە ئەو ڕۆژە دەڕواو هەرگیز ناگەڕێتەوە،
- ئەگەر تەمەشای دوێنێت کرد، بیرلەکارە چاکەکانت بکەوە، بۆئەمرۆش خەریکی کردەوەی چاك بە، بۆسبەیش بیر لە هیواو ئامانجی بەرزت بکەوە، بۆئەوەی بەدڵخۆشی و کامەرانی بژیت،
- تەمەن درێژی، پڕەلەتاقی کردنەوە، زانکۆیەکە پڕە لەزانیاری، کۆگەیەکە لێوانلێولەزانست و هزر، هەر ڕۆژێکت بەسەر دا تێپەڕی، واتە وانەیەکت لەهونەری ژیان وەرگرت، تەمەن درێژی بۆ پیاوی ئاقڵ و تێگەیشتوو، پیرۆزە،
- کەمێك ترس پێویستە، تا ئاسوودە بوونت بخاتەوە یاد، هانت بدا بۆ پاڕانەوەو دوعا، لەسەر پێچی کردندا بتگەڕێنیتەوە، ئاگاداریەکیش بێ بۆهەبوونی مەترسی لەوەش گەورەتر،
- کەمێك نەخۆشی پێویستە، تاوەکو ئەو تەندرووستیەت لەبەر چاو بێت، لووت بەرزی و خۆبەگەورە زانین لەڕەگو ڕیشەوە



www.iqra.ahlamontada.com

دەربهێنێ دڵیش لەخەوی بێ ئاگایی هۆشیار بکاتەوە،

- ژیان خۆی کورتە، تۆش بەخەم و خەفەت کورت تری مەکە، هاورێ ژمارەیان کەمە، بەلۆمەو گلەیی لەدەست خۆتی مەدە، دوژمن و ناحەز زۆرن، بە خورەوشتی نابە جێ زیاتریان مەکە،
- لەهەوڵ و تێکۆشان، وەکو مێرووله بە، سەد جار هەوڵی سەرکەوتنە سەر دارێك دەدات، دەکەوێتە خوارەوە، بێزارنابێ و کۆڵ نادات، تالەدواییدا دەگاتە شوێنی مەبەست،
- وەکو هەنگ بە، شتی پاك و خاوێن دەخوا، لەناو گوڵو گوڵزارە، هەنگوین بەرهەم دەهێنێ، ئەگەر کەوتە سەر نەمام نایشکێنێ، ئازاری گوڵیش نادات،
- فریشتە ناچێتە ئەوماڵەی سەگی تێدایە، ئەی چۆن ئاسوودەیی دەچێتە ئەو دڵەی لەسەگی ئارەزوو گومان پڕ بێت،
- لەو دانیشتنانەی، کێشەو گرفتی تێدا باس دەکرێت دووربکەوە، چونکە بەنرخێکی کەم ئایین دەفرۆشرێ، پیاوەتی و جوامێری تێدا نییە، شەرەف و ئابڕوو ژێر پێ دەخرێت،
- پێشبڕکێ بکەن، واتە خێرابن، چونکە ڕۆژگار بەپەلە بارگەی تێك دەنێ، خۆرو مانگ بەردەوام لەخولانەوەو ڕۆیشتندان، باو هەوا هەڵدەکاو دەڕوا، کاروانی ژیان چاوەڕێت ناکات،
- ﴿وَسَارِعُوا﴾ ال عمران / ١٣٣
- واتە : بەپەلە بن و پێش برکێ بکە(ت:ئاسان)



www.iqra.ahlamontada.com

- ڕاپەڕە بۆبەرزی و هەوڵ بدە، نەمری بەخەبات و تێکۆشان دەبێت، سەرکەوتن لەسەر خوانی زێڕ پێشکەش ناکرێ، بەڵکو بەفرمێسك و خوێن و ماندووبوون و شەو نخوونی و ڕەنج و کوێرەوەری و دەردەسەری پەیدا دەکرێ،
- بۆنی ئارەقەی کرێکار لەبۆنی مسکی بێ کار خۆشترە، هەناسەی ڕەنجبەران جوانترە لەسرودی تەمبەڵان، ئەستورك خۆشترە لای برسی لە گۆشتی بەرخ لای دەوڵەمەند،
- ئەو جنێوەی لەلایەن ئیرەیی بەرانەوە، بەسەرکەوتووان دەدرێ، وەکو تەقاندنی تۆپی خۆشی و ئاگادارکردنەوەی سەرکەوتن و هەروەها ڕێکلامێکی بەخۆڕاییە،
- بۆ پێش کەوتن و سەرکەوتن، خزم و عەشیرەت، ئاستی دەرامەت، پلەی خوێندن، گرنگ نییە، بەڵکو هەرکەس ئارەزوویەکی بتەوو دڵێکی مەزن و پڕئومێدو ویستێکی قایم و سەبرو پشووی درێژی هەبێت، بەئامانجە بەرزەکانی دەگات،
- لەبەرانگاربوونەوەی سەختی و ئاستەنگ مەترسە، شێر بێ ترس و بەتەنیا بەرەنگار مێگەلێك حوشتر دەبێتەوە، گلەیی لەناخۆشیەکانی ژیان مەکە، گوێدرێژ چەند باری زیاتر لەسەر پشتی دابنرێ نقەی لێوەنایەت، لەداواکاریەکانت بێزارو نائومێد مەبە، سەگ بەدوای نێچیر ڕادەکا، ئەگەر بچێتە ناو ئاگریش هەرلەدوای دەبێت،


www.iqra.ahlamontada.com

- تەنیا بەڕای خۆت مەکە، بەڵکو ڕاوێژو ڕاپرسی بکە، چونکە دووئەقڵ لەئەقلێك باشترە، هەروەکو گوریس و پەت، چەند ئەستورتر بکرێ پتەو و قایمتر دەبێت ،
- هەموو ڕەخنەیەك بەدژایەتیکردن مەزانە، بەچاو داپۆشین لەمەبەستی ئەو سوودی لێ وەربگرە، چونکە تۆ پێویستیت بە خۆباشتر کردنە نەك ستایش و پێ هەڵگۆتن،
- ئەوەی ئەو خەڵکە بناسێ، نەبە پێدا هەڵگۆتن دڵخۆش دەبێ، نەبەگلەییان دڵتەنگ دەبێ، چونکە خێرا ڕازی دەبن و خێرا تووڕەدەبن، بێ بنەما، هەربەئارەزوو ڕەفتار دەکەن،
- گومانت نەبێت، بۆگەیشتن بەئامانج، کەمئەندامی ڕێگربێت، چەندین کوێرو کەڕو گۆج، بەهۆی ئەفراندنەکانیانەوە، بەنەمری مانەوە، چونکە ئەمە پەیوەندی بەکۆئەندامی لەش نییە، بەڵکو ویست و ئیرادەیەکی قایم،
- لەوانە نەدانی بەخشش بێت، قەدەغەی لەتۆبەزەیی بێت، نەگەیشتن بە مرازو ئاوات، چاودێری بێت، چونکە خودای پەروەردگار لەخۆت باشتر دەزانێ،
- ئەگەر تووشی کێشەو تەنگو چەلەمەیەك هاتی، باش بزانە وەکو هەورێکی هاوینەو خێرا نامێنێت، لەبروسکەکەی مەترسە،، لەوانەیە بارانی ڕەحمەتی لەگەڵ دابێت،
- هەفتەی جارێك بۆسەیران، بۆدەرەوەی شار بڕۆن، منداڵەکانت


www.iqra.ahlamontada.com

زیاتر پێ ئاشنا دەکا، ژیانت تازەدەکاتەوە، بێزاری و هەراسانی ناهێڵێ.

- ئەگەر کەسێك لەماڵی خۆی دڵشاد نەبێت، لە هیچ شوێنێکی تر، دڵشاد نابێت، چونکە چاکترین شوێن بۆئارامی دەروون و ئاسوودەیی دڵ و بێ ئەرکی، تەنیا ماڵی خۆتە،
- نەمری بۆئەو کەسانەیە، خەڵکیان فێری زانست و ڕۆشنبیری کردووە، یالەکتێب بڵاویان کردۆتەوە، بەڵام کورسی و دەسەڵات، وەکو سێبەرو خەون، خێرا نامینێ،
- ئەگەر واز لەهزرو بیرکردنەوە بهێنین، بۆخانەی دەردو بەڵادەچیت، تووشی خەم و خەفەت و ئازارمان دەکات، کەواتە لێی مەگەڕێ بە ئارەزووی خۆی ڕەفتار بکا، بیبەستەوە، بۆکاری چاك بەکاری بهێنە،
- ئەوەی دڵ پەرێشان و تەنگ دەکات، زۆر تێکەڵاوی لەگەڵ خەڵك دانیشتن و بیستنی قسەی بە سوود، ئای چەند خۆشە گۆشە گیری، بەو مەرجەی خودا پەرستی و زانینی لەگەڵ بێت،
- رێگای چونە مزگەوت بەرزترین و بەنرخترین ڕێگایە، ڕێگای گەڕانەوە بۆماڵ ئارامی بەخشە، وەستان لەبەردەم سوڵتان ناخۆشترین کاتە، جوانترین شێوەی مرۆڤ کاتی کڕنووش و سوجدەیە بۆ خودای پەروەردگار،
- باخچەی پڕ لەگوڵ و گوڵزار بۆدڵ، خوان و سفرەیە بۆدەروون،



www.iqra.ahlamontada.com

بیستنی قورئان بەدەنگی خۆش، یادکردنی خودا بە دڵێکی بە ئاگا، هەبوونی پارەی حەلال بۆخەرج کردن، وەعزو ئامۆژگاری بە زمانێکی پاراو،

- خورەوشت و ڕەفتاری باش، لەڕوخساری جوان و چاوی ڕەش و ڕوومەتی ناسك جوانترە، چونکە جوانی ناوەڕۆك زۆر گرنگترە لەجوانی شێوە،
- چاکە کردن لەلێ قەومان بەدوورت دەکا، دیواری ئەقڵ نایەڵێ حەزو ئارەزووەکانت تووشی کارەساتت بکا، زەنگی تاقی کردنەوەکان لەهەزار ئامۆژگاری کار سوودبەخشترە،
- ئەگەر هەزاران کەست دیت، تەمەنی خۆیان لەهونەرو ڕابواردن و یاری بەفیڕۆدا، زۆر سوپاسی خودا بکە، چونکە بە دیتنی گرفتارو لێ قەوماو، بیرهێنانەوەیە بۆ بێ وەی،
- ئەگەر بێ باوەڕت دیت، لەسەر ئایینی ئیسلام، سوپاسی خودا بکە،
- ئەگەر ستەمکارت دیت، لەسەر تەقوا، سوپاسی خودا بکە،
- ئەگەر نەفامت دیت، لەسەر زانین، سوپاسی خودا بکە،
- ئەگەر نەخۆشت دیت، لەسەر لەش ساغیت، سوپاسی خودا بکە.
- خۆر بۆتۆ دروست کراوە، بەڕوناکیەکەی، خۆت خاوێن و جوان بکە،
- هەوا بۆ تۆ دروست کراوە، بەبای شەماڵ، دڵت خۆش بکە،



www.iqra.ahlamontada.com

- رووبارەکان بۆتۆ دروستکراون، ئاوەسازگارەکەیان بنۆشە،
- میوەجات بۆتۆ دروست کراوە، بیخۆ، سوودی زۆرە،
- لەسەر هەموو ئەوانە سوپاسی پەروەردگار بکە،
- هیـواو ئـاواتی کـوێر دیتنـی دنیایـە، کـەڕ بیسـتن، گـۆج و شـەل ڕۆیشتن، لاڵ قسەکردن، تۆدەبینی، دەبیستی، هاتو چۆو قسـەش دەکەی !
- گومـان نەبـەی، ژیانـە لەهـەموو ڕوویێکـەوە بـۆمرۆڤ بەتـەواوی بۆکەس بلوێت، ئەوەی خـانووی هەیـە ئۆتـۆمبێلی نییـە، ئـەوەی هاوسەری هەیە، کارو کاسبی نییـە، ئـەوەی ئـارەزووی خـواردنی هەیـە، لەوانەیـە خـواردنی دەسـت نەکـەوێت، ئـەوەی خـواردنی هەیە لەوانەیە لێی قەدەغەکرابێت،
- مزگەوت، بازاڕی دواڕۆژە، کتێـب هـاوڕێی ژیانـە، کـارو کـردەوەی چـاك سـێبووری و هاوڕێیـە لـەگۆڕ، خورەوشـتی چـاك و جـوان، تاجی شەرەفە، ڕێزگرتن جوانترین جلوبەرگە،
- نەکەی کتێبـی خوانـەناس و بـێ ئایەنـەکان بخوێنیتـەوە، جـۆرە پیسـیەکی تێدایـە، دڵ بۆگـەنی دەکـات، ژەهـرەو پیـاو دەکوژێـت، چلکێکە ویژدان وێران دەکات، کەواتـە چـاکترین کتێـب قورئانـە، ڕوحت پاك دەکاتەوە و نەخۆشیەکانت چارە سەردەکات،
- بـۆ ئـەوەی پەشـیمان نەبیتـەوە، هـەرگیز لـەکاتی تووڕەییـدا بڕیارمـەدە، چـونکە مرۆڤـی تـوورە، ئاگـای لـەڕەفتارەکانی خـۆی


www.iqra.ahlamontada.com

نییە، نازانێ چی دەکات، لێی ورد نابێتەوە،

- ئـەوەی چـوو بەخـەم و خەفـەت ناگەڕێتـەوە، تـرس لـەدوا ڕۆژ سـوودی نییـە، دڵـەڕاوکێ سـەرکەوتن دابـین ناکـات، بـەڵکو دڵـی بەهێزو خۆڕاگر و ڕەزابـوون بـە کـردەوەی خـودای پـەروەردگار، دووباڵی کامەرانین،
- داوا لە خەڵك مەکە تاوەکو ڕێزیان بگـری، ڕێـزت بگـرن، لۆمـەی کەس مەکە، گلـەیی لـەخۆت بکـە، ئەگـەر ویسـتت خـەڵك ڕێـزت بگرن، ڕێزی خۆت بگرە،
- خاوەن کۆلیتەو خانوو کەلاوە، کەزانی کۆشك و تەلار دەڕووخـێ و نامێنێ، بابەتەقسیمی خودا ڕازی بێت، خاوەن جلی دڕاوو بـە پینە، بادڵنیاو ئارام بێت کاتێك زانی ئاوریشم دەڕزێت،
- ئەوکەسەی هەموو داواکاریەکانی دەروونی جێبەجێ بکـات، دڵـی پەرشو بڵاو دەبێت، خۆی ون دەکات، خەمی زۆر دەبێت، چـونکە ئارەزووەکــانی مــرۆڤ ســنووری نییــە، فــەرمان دەداو هــەڵت دەفریوێنی،
- ئەی ئەو کەسەی کوڕی مردووە، کۆشـکی (الحمـد)ت لەبەهەشـت بـۆ دانـراوە، ئـەی بـێ بـەش لەخۆشـییەکانی ژیـان، بەشـی تـۆ لەبەهەشت چاوەڕێتە،
- ڕۆژی بۆناو هێلانەی باڵنـدە نایـەت، شـێر لەلانەکەیـدا خـۆراکی نـادرێتێ، مێـروو لەشـوێنەکەیدا دانەوێڵـەی بـۆ دابـین ناکرێـت،



www.iqra.ahlamontada.com

بەڵکو هەموویان هەوڵ دەدەن، تۆش لەدوای ڕۆژییەکەت بە، وەکو ئەو گیانلەبەرو زیندەوەرانە پەیدای بکە،

- ﴿يَحْسَبُونَ كُلَّ صَيْحَةٍ عَلَيْهِمْ﴾ المنافقون / ٤.

واتە (هەرهاوارو بانگێك بکرێت، هەرباسێك بێتە پێشەوە، وادەزانن دژی ئەوانە) (ت:ئاسان)

- ئەوانە بەر لەمردن، دەمرن، چاوەڕێی کارەساتن، بیرو بۆچونیان هەر ماڵوێرانییە، لەهەموو جووڵەو دەنگو خەیاڵێك دەترسن، چونکە دڵیان تەنیا پڕلەهەوایە، دەروونیان هەلاهەلایە،
- ئەگەر هەژاری، بەکاری خودای پەروەدگار ڕزای بە، مەڵێ خۆزگە دەوڵەمەندی دەکردم، ئەو باشتر دەزانی، ئەگەر نەخۆش کەوتی ئارام بگرە، تا شیفات دەدات،
- ڕەنگە دواکەوتنت لەسەفەرە خێری تێدا بێت، لەوانەیە بێ هاوسەر بوون بۆتۆ باشتر بێت، بەڵکو وەرنەگیرانت لەکارێك، بەرژەوەندی تۆی تێدا بێت، چونکە ئەو دەزانی، تۆ نازانی،
- بەرد لەدار بەهێزترە، ئاسن لەبەرد بەهێزترە، ئاگر لەئاسن بەهێزترە، با لەئاگر بەهێزترە، ئیمان و باوەڕیش لە بابە هێزترە،
- هەرکارەساتێکت توش بێت، وانەیەکەو لەیاد ناکرێ، لەمێشکتدا وەکو نەقش دەچەسپێت،
- سەرکەوتن بریتییە لەچەند دڵۆپ لەچەرمەسەری و



www.iqra.ahlamontada.com

کـــوێرەوەری و بـــڕین و وئـــازارو هـــاوار و مانـــدووبوون، سەرنەکەوتن بریتییە لەچەند دڵۆپ لەتەمبەڵی و تـەوەزەلی و بێ دەسەڵاتی و کەمتەر خەمی و هەوڵ نەدان،

- مرۆڤێکی سادەو ساکارو بێ ویستی بەرزە، ئەو کەسەی تەنیا بـۆ نـاو بانگیـەکی کـاتی هەوڵبـدا، نـەك بـۆ نـەمری و زانسـت و کردەوەی چاك.

- (یابلال، اقم الصلاة، ارحنا بها)رواه ابو داود

واتــە : (ئـەی بـیلال، بـانگ بـدە، بـا نوێژبکـەین، و دەروونمـان بحەوێنینەوە)ئەبوداود

- چـونکە نوێـژ ئـارامی بەخشـە، ڕووبارێکـە لەئاسـوودەیی، شـنە بایەکی سادەو فێنکە بەسـەر دڵ و دەروونـدا تێدەپـەڕێ، ئـاگری ترس و خەم و خەفەت دەکوژێنێتەوە،

- ئەگـەر بـێ فـەرمانی خـوداو سـتەمت لەکـەس نـەکردووە، پیرۆزباییت لێ بیت، مزگێنیت دەدەمـێ بـە کـەماڵی ئیسـراحەت بخەوە، دەستت خۆش بێت، چونکە دوژمنت نییە،

- ئافـەرین بۆئـەو کەسـەی خـەڵك دوعـای بۆدەکـەن، هـاوار بۆئـەو کەسەی خەڵك دوعای لێ دەکەن، مژدە بۆئەو کەسـەی خۆشـیان دەوێـت، خەسـارەتمەندی بۆئـەو کەسـەی خـەڵك نـەفرەتی لـێ دەکەن،

- ئەگـــەر لـــەدادگای دونیـــا، داد پەروەرنـــەبوون لەگەڵتـــدا،



www.iqra.ahlamontada.com

دۆسییەکەت بۆدادگای دوارۆژ بـەرز بکـەوە، لەوێـدا فریشـتەکان شاهێدن، دادوەریش، خودای بەرزو پەروەردگارە،

- ﴿فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ﴾ البقرة/١٥٢

واتە (دەی کەواتە، ئەی ئیمانداران، ئەگەر یادی مـن بکـەن، منـیش یادی ئێوە دەکەم)(ت:ئاسان)

- یادی خودا، ئەگەر تەنیا ئەوەندە سوودەی هەبوایـە، بـەس بـوو، ئای لەو نەمرییەو خۆشییەو شەرەفەگەورەیە.
- چـاوت ڕوون بێت،.....دەسـت نوێـژ نیـوەی ئیمانـە، گونـاح دەسرێتەوە تـاوان ناهێڵێـت، بۆچـوونە خزمـەت پاشـای پاشـایان، پاك و خاوێنت دەکاتەوە.
- ئەی نوێژ خوێن، دەستت خۆش بێـت، نوێـژ گونـاح دەسـڕێتەوە، دوا ڕۆژت چاك دەکات، لەدیلی ڕزگارت دەکات، ڕووناکی چاوە،
- ئـەوەی بیـەوێت، بـێ ئـەوەی گلـەیی لـێ بکرێـت و ڕەخنـەی لـێ بگیرێـت، ڕێـزی خـەڵکی دەسـت بکـەوێت بـەد بـەختی و چـارە ڕەشی ڕووی تێ دەکات، هەوڵدان بۆ ناوبانگی و نەمری، دوژمنـی کامەرانییە.
- بەختـەوەری بەتـەنیا بـەبیردۆزو وانـە دابـین نابێـت، بـەڵکو پێویستی بەکارو هەوڵدان هەیـە، بۆنموونـە هـەموو ڕۆژ بـە پـێ ڕۆیشتن بۆماوەی یەك کاتژمێر، یاگەشت و سەیران یا سەفەر،
- مێشـوولە زۆر خـەریکی شـێر دەبێـت و ئـازاری دەدات، بـەڵام


www.iqra.ahlamontada.com

شێرەکە گوێی پێ نادات،، چونکە سەری قاڵە بەمەبەستەکانی خۆی،

- دووربکەوە لەمرۆڤی ڕەشبین، گوڵی نیشان دەدەی، دڕکەکەی دەبینێ، ئاوی خاوێنی دەدەیێ، لەچڵکی دەگەڕێ، تۆباسی خۆرو سوودەکانی بۆبکەی، گلەیی لەگەرمیەکەی دەکات،
- ئایە بەختەوەری ڕاستە قینەت دەوێ، لەشوێنی دوور بەدوای مەگەڕێ، بەڵکو لەناوەوەی خۆتە، لەشێوەی بیرکردنەوەتە، لەئەندێشەو خەیاڵتە، لە دڵ و مێشکی ڕووناکتە، لەئامانجە باشەکانتە.
- بەختەوەری، ئەو بۆنە خۆشەیە، کاتێك لەدەوروبەری خۆت پەرش و بڵاوی دەکەیەوە، بێگومان چەند دڵۆپێك بەرت دەکەوێت،
- کارەسات ئەوەیە، ئێمە بێجگە لەخودای پەروەردگار ڕۆژی سەدجار زیاتر لە هەڵەکردن، دواکەوتن، پەلەکردن، تووڕەنەبوونی فلانەکەس، گومانی فلانەکەس،................، دەترسین،
- زۆرخەڵك باوەڕیان وایە، ماوەی خۆشی کورتەو ماوەی خەم و خەفەت زۆرە، کەواتەباوەڕیان بەمردنی خۆشی و شادی و نەمردنی دەردووبەڵاهەیە،
- هەندێکمان وەکو ماسییەکی کوێری ناو دەریا، وا گومان دەبا



www.iqra.ahlamontada.com

لەنێو جامە ئاوێکە، هەروەها ئێمەش لەنێو دەریای باوەڕو ئیمان دروست کراوین، کەچی بەچیای ڕق و ترس و دوژمنایەتی و خەم، خۆمان دەورە داوە،

- ژیان پیرۆزە، دیاریش پێویستە بدرێتە ئەو کەسەی شایانیەتی، ئەو کەسانەی ژیان لەبەرامبەریان لەزەردەخەنەو پێکەنین دایە، ئەوانیش ددانی لێ جیڕدەکەنەوە شایەنی ژیان نین،
- ڕاوکەرێك کۆترێکی خستە قەفەز، کۆترەکە دەستی بەگۆرانی کرد، پێی گوت، کەی ئێستا کاتی گۆرانییە، گوتی سەعات دوای سەعات، گوشادی و ڕزگاربوون هەیە،
- بەزانایەکیان گوت : بۆسەردانی سوڵتان ناکەی، بەتوورەگەی، زێڕدەبەخشێ ؟، گوتی : دەترسم ئەگەر تووڕەبێ، سەرم ببڕێ و بخاتە یەکێك لەم توورەگانە و بۆخێزانەکەم ڕەوان بکاتەوە،
- بۆ وەڕینی سەگ دەبیسی، گوێت لە گمە گمی کۆتر نییە ؟،
- بۆجوانی تریفەی مانگ و ئەستێرەکان نابینی، تاریکی شەو دەبینی ؟
- بۆ گلەیی لەپێوەدانی هەنگ دەکەی، هەنگوینی بەتام و شیرین لەیاد دەکەی ؟
- باوکە ئادەم، ئەو کاتەی پەشیمان بوویەوە، خودای پەروەردگار بۆ پێغەمبەرایەتی هەڵی بژارد، لەپشتی ئەو پێغەمبەران و شەهیدان و پیاو چاکان و زانایانی پەیدا کرد، کەواتە پاش ئەم



www.iqra.ahlamontada.com

گوناحە بەرز و مەزن کرا، نەك لە پێش گوناح !

- کەلافاو هەڵسا، حەزرەتی نوح (د.خ) هاواری کرد (یارحمن یامنان)، یەکسەر خودای پەروەردگار، لەچاو تروکانێك فریای کەوت، بێ باوەڕانیش خنکان و تێك شکان،
- حەزرەتی یونس (د.خ) لەسێ تاریکایی و لەقووڵایی دەریا، نامەیەکی دا نیێنان بەتاوان و کەمتەرخەمی خۆی، بەپەلە بۆپەروەردگار نارد، چونکە بەڕاستی بوو، بروسك ئاسا فریای کەوت.
- بۆیە حەزرەتی داود (د.خ) ڕەنگی جلی تۆبەی سپییە، چونکە قوماشەکە لەسوجدەگا چنراوە، بەیانی زوو بە فرمێسکی تۆبە شوراوە.
- ئەگەر خەمەکانت زۆربوون، تووشی ناخۆشی و تەنگ و چەڵەمەو هەروەها نائومێدیش ڕووی تێکردی، چاوەڕێی دەربازبوون بکە،
- ئەگەردەتەوێ، پەروەردگار لەخەمی بچووك وگەورە ڕزگارت بکا، ئومێد و هیوات لەهەموو کەس ببڕە، تەنیا ڕوو لە خودا بکە و پشتی پێ ببەستە،
- دەروونت وەکو ڕەنگی شلەی ناو ئەو جامەی تێیدایە دەبێت، ئەگەر ڕەزابوونی تێیدابێت، کامەرانی و خۆشی و جوانی دەبینرێت، بەپێچە وانەش ئەگەر دڵتەنگی و نائومێدی تێدا


www.iqra.ahlamontada.com

بێت، ئەوا ناشیرین و ئێسك گران و ڕەزا قوڕس دەبینرێت،

- ئەگەر گوێڕایەڵی خودای پەروەردگار بکەیت و بەهەبوون و نەبوون لێی ڕازی بیت، دەگەیتە هیواو ئامانج و ئومێدەکانت.
- هەر کەسێك لەناودڵیدا، ڕەزێك لەباوەڕو یاد کردن، لەناو مێشکیدا باخێك لەزانست و تاقی کردنەوەی ڕۆژگار هەبێت باخە م بۆدونیا نەخوات،
- ئەوەی دەست لە کامەرانی هەڵبگرێ تاکوڕەکەی دێتەوە، یاخانوو دروست دەکا، یاکارو کاسبیەکی چاکی دەست دەکەوێت، تووشی زیندە خەون و بە تراویلکە و خەیاڵ هەڵخەڵەتاوە،
- بەختەوەری : بریتییە لە گوێ پێ نەدان، لەچاوەڕوانی ڕووداو واز هێنان، لەترس فرێ دان،
- بزە خەنە : جوان و پیرۆزە، سەرەتایی دۆستایەتییە، خۆشەویستیە، نیشانەی برایەتییە، نامەیەکی بەپەلەی ئاشتییە، چاکەیەکی لای خودا وەرگیراوە، چونکە نیشانەی ڕەزابوونە ،
- لەپشێوی و ئالۆزی و شپرزەیی و پەرێشانی دوور بکەوە، هۆیەکانی، واز هێنان لەرێکو پێکی و پەیرەوو ڕێبازو نیزام، چارە سەر، مرۆڤ خشتەیەکی باش بۆخۆی دابنێ،
- ئەگەر کارەساتێکت بەسەر هات، بە تێپەڕبوونی هەر ڕۆژێك بەسەری دا، دڵخۆش بە، چونکە بەرە بەرە لەسەرت سووکتر



www.iqra.ahlamontada.com

دەبێت و تەمەنی کورت دەبێتەوە، لەبەر ئەوەی کارەسات وەکو مرۆڤ تەمەنی هەیەو لێی تێنا پەڕێ،

- بۆ داواکارییەکانی دونیات، پێویستە سنوورێك هەبێت، بۆ نموونە، خانوو، کاری گونجاو، ئۆتۆمبێل، بەڵام ئەگەر دەروونت بەرەڵا بکەی، ئەوا لەناوت دەبات،
- ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي كَبَدٍ﴾ البلد / ٤

واتە : (بەڕاستی ئێمە، ئینسا نمان دروست کردووە، بەردەوام لەناڕەحەتی و سەغڵەتی و کێشەو ناخۆشیدایە)(ت: ئاسان)

- بۆ مرۆڤ بنچینەیەکی نەگۆڕە، بەردەوام لە کێشەو چەرمەسەری ناخۆشی دادەبێت، دەبا ئەمە چاك بزانی، بەم شێوەیە لەژیاندا هەڵسوکەوت بکا،
- ئەو کەسەی شەوو ڕۆژ خەریکی ڕاوو یاری و ڕابواردنت بێت، وادەزانی خۆی کامەران دەکات، ئەی نازانی دەبێ نرخەکەی بدات، کە خەم و ناخۆشییە، چونکە نەیزانی تەرازوویەکی لەنگەر لە نێوان ئەرك و فەرمان لەگەڵ ڕابواردن دابنێت،
- لە ژیانتدا بیکە بنچینە، هەرچی زیادە هاتە پێش چاوت، هەتا ئەو پارچە کاغەزەی لە گیرفانتدایە، لەسەر مێزە،،........ فڕێی بدە، چونکە هەرچی لە پێویستی زیاتر بێت زیان بەخشە،
- هاوەڵانی پێغەمبەر (د.خ) لەهەموو کەس کامەرانتر بوون، چونکە زۆر گرنگییان بە خەتەرە بەدڵداهاتن و شتی سادەو



www.iqra.ahlamontada.com

ساکار و پڕو پوچ نەدەدا، بەڵکو خەریکی بنچینەو بەها گرنگەکان بوون،

- لەبەرەوەی ئایین بۆ فیقھ، نوێژ بۆ ملکەچی، قورئان خوێندنەوە بەبێ ئاگایی، سوودی نییە، کەواتە پێوستە بەتەرکیزو ئاگاداربوونی دڵ خودا پەرستی بکەی،
- ﴿وَالطَّيِّبَاتُ لِلطَّيِّبِينَ﴾ النور/٢٦

واتە : (ئافرەتانی پاك بۆ پیاوانی پاك)(ت: ئاسان)

- چاکی لە قسە لەکارو کردەوە، لەخوڕەوشت، لەهاوسەر، بۆئەوەی شادمانی دروست بێت،
- ﴿وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ﴾ آل عمران/١٣٤

واتە : ڕق و قینەی خۆیان دەخۆنەوە خۆگرن)(ت:ئاسان)

- بەدەر نەبڕینی قین و تووڕەیی لەکاتی جنێودان و ئازاردانی، هەروەها وازهێنان لەتۆڵەسەندنەوە، خودا ئاگادارە،
- ﴿وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ﴾ آل عمران/١٣٤

واتە : (لەخەڵکی خۆش دەبن و لێبووردەن)(ت:ئاسان)

- ئەو کەسانەی لەجیاتی تۆڵە، لێخۆشبوون و لێبووردەیان هەیە، بەرامبەر ئازاردەرانیان، گەردنیان ئازاد دەکەن،
- ﴿وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾ آل عمران/١٣٣
- واتە : (خوای میهرەبانیش چاکە کارو چاکە خوازانی خۆش



www.iqra.ahlamontada.com

دەوێت) (ت: ئاسان)

- خودای پەروەردگار ئەو کەسانەی خۆش دەوێت، لەستەمکار دەبوورن، چاکەشیان لەگەڵ دەکەن بە پارە، بەبەخشش، ئەمەش بەرزترین پلەیە،
- کاغەزێك بێنە، ئەو کاتانەی تێدا تۆماربکە، کەی دڵت خۆش و کامەران دەبێت، ئایە دوای گفتوگۆ لەگەڵ کەسێك، یاچوونت بۆ شوێنێك، یادوای ئەنجامدانی کارێك، دوای هەفتەیەك دەبینی لیستەیەکت لەو کارو کردەوانەی دڵشادت دەکا هەیە،
- هەرچی دڵخۆش و شادمانت دەکا بیکە، دووربکەوە لەوانەی خەمبارو دڵتەنگت دەکا، بابرپیاری هەوڵدانت بۆگەیشتن بە بەختەوەری تاقی کردنەوەیەکی خۆش بێت،
- مادام ڕێگای ڕاستت گرتووە، گرنگی بەڕەخنەمەدە، چونکە ئەگەر گومان و دڵەڕاوکێت لەتاوان و گوناح، هەبوو، بەختەوەری ڕادەکا،
- چاکەو خزمەتی خەڵك بکە، بەتەنیاو گۆشە گیر دامە نیشە، چونکە تەنیایی سەرچاوەی بەد بەختیە، کاتێك تێکەڵاوی کەسو کارو خەڵك دەبیت، هەرچی خەم و بێنەوایی و دڵە ڕاوکێ هەیە نامێنێ، بۆیە پزیشکان، بۆچارەسەری نەخۆشی خەمۆکی دووهەفتە خزمەتکردنی خەڵکیان وەك چارە سەر



www.iqra.ahlamontada.com

داناوە،

- بەردەوام، بێ وەستان، خۆت خەریکی ئیش و کاربکە، هەوڵیش بدە هەموو توانات بەکار بیهێنی، ئەگەر خۆت خەریکی کاری چاك کرد، ئەوە دڵشاد دەبێت، چونکە تەمبەڵی و دانیشتن، خەم و خەفەت زۆر دەکات،
- بەر بەرەکانی پەرێشانی و تێکشکان بکە، ئەگەر لەشتێك بێزارو وەڕس بووی، هەڵسەبەئەنجامدانی کارێك، وەکو ئەو وەرزشەی جاران لات خۆش بوو، یا گەشتێك لەگەڵ هاورێیانت ئەنجام بدە.
- بەتەواو کردنی کارو فرمانێك، هەناسە ساردو نائومێد مەبە، دەبێ بزانی کاری پیاوی مەزن بەردەوامەو هەرگیز تەواو بوونی نییە، کەسانێك هەنە، وادەزانن ئەگەر هەموو کارەکەیان نەکرد، لەخۆیان ڕازی نابن و دڵشاد نابن، بەر پرس دەتوانی ئەو کارەی پێ سپێرراوە، بەبێ کەم و کوڕی ئەنجامی بدات، هەست بەکامەرانیش بکات، مادام درێغی تێدا نەکردووە،
- ڕکابەری لەگەڵ کەس مەکە، بەرِەقی ڕەفتار لەگەڵ خۆت مەکە، بەتایبەتی کاتێك پێشبڕکێ لەسەر ماڵی دونیا دەکەن، مەرجی بردنەوەی سامانەکە، بکەیتە بنچینە ی بەختەوەری،
- هەست و داخوازیەکانت کپ مەکە، بەڵکو دەری بخە، چونکە دڵە



www.iqra.ahlamontada.com

ڕاوکێ دروست دەکات، بە شێوەیەك دەری ببڕە، تاپاڵەپەستۆکەی لەسەرت نەمینێت، ئەگەر وانەکەیت کامەران نابیت،

- ﴿وَلاَ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾ الانعام/١٦٤

واتە : (هیچ کەسێك باری گرانی تاوانی کەسی تر هەڵناگرێت) (ت: ئاسان)

- ئەگەر یەکێك گوناح و تاوانێکی کرد، خۆی بەر پرسیارە، تۆخەمبار مەبە، گوناهی خۆی لەئەستۆی خۆیەتی، چونکە سۆزو بەزەیی و هاوکاریش سنووری خۆی هەیە،
- خێرا بڕیارەکانت بدە، ئەو کەسەی بڕیارەکانی دوا دەخا، بە کاتژمێرو ڕۆژو مانگ لەکاتی شادمانی خۆی دەبڕی، بش زانە مەرج نییە دوا بریاردان، چاککردن یاپاشگەزبوونەوەی تێدانەبێت
- ڕێزی خۆت بگرە، ئەگەر ویستت هەرکارێك بکەی، بیرلەپەندی (بەزەیی خودا برژێ بەسەر ئەو کەسەی خۆی دەناسی) بکەوە، بۆنموونە ئەگەرتەمەنت پەنجا ساڵە ویستت وەرزش بکەی، تۆپێن مەکە، بەڵکو مەلە یا تەنس یا بەپێ هاتو چۆبکە، هەروەها پەرە بە ئارەزووەکانت بدە،
- خۆت بناسە، چونکە ئەوانەی بەردەوام بەدوای ژیان کەوتوون، بێ ئەوەی دەرفەتێك وەرگرن بۆتەمەشاکردنی خۆیان، کەواتە


www.iqra.ahlamontada.com

نەفامییە، ئەو کەسەی خۆی نەناسێت و تواناى خۆی نەزانێ،

- لـەکارو فرمـان مامناوەنـدی بـە، یۆنانیـەکان باوەڕیـان وابـوو، ئەگەر کاتی پشوو و سرەوتن و سانەوە لەمرۆڤ بسەندرێ، مافی پێ شێل کراوە،
- کاری گەورەو نائاسایی بکە، چونکە بەدەستهێنانی ژیانی خـۆش، پەیوەسـتە بـە خـۆتێ خزانـە نـاو کـارو کـردەوەی مـەزن و بـە مەترسـی، بۆنموونـە بۆفێربـوونی مەلـەوانی، پێویسـتە مـرۆڤ بەرەنگاری خنکان بێتەوە،
- هەموو قوفلێك دەکرێتەوە، کۆت و زنجیر دەپسێت، دوور خـراوە دێتەوە بەلاّم لەکات و ساتی خۆی،
- ﴿اسْتَعِينُواْ بِالصَّبْرِ وَالصَّلاَةِ﴾ البقرة/١٥٣

واتە : (داوای کۆمەك و یارمەتی لەخوابکەن، بەهۆی ئارام گـرتن و نوێژ کردنەوە) (ت: ئاسان)

مژدەبـدە بـەو کەسـەی بەردەوامـە لەسـەر نوێـژو خـاوەن سـەبرو ئارامە، بەسەر کەوتن و پاشەڕۆژێکی باش،

- بەقامچـی و ڕاکێشـان لێـدان و دەرکـردن، بـیلال ئەشـکەنجە درا، بەلاّم هەر دەیگوت (ئەحەد، ئەحەد) چونکە (قـلْ هواللـه أحـد) ی ئەزبـەر کردبـوو، کاتێـك دەچـێتە بەهەشـت، پاداشـتێکی گـەورەی دەدەنـەوە، لەبەهەشـتیش ئـەوەی بـۆ خـودای کـردووە



www.iqra.ahlamontada.com

بەکەمی دەزانیّ و بەهیوای زۆر تربووە،

- دونیـا چـییە ؟ ئایـا ئـەو جلـە جـوان و گـران بەهایانەیـە، خزمەتیان دە کەی، خزمەتت ناکەن، یا ئەو هاوسـەرە جوانەیـە، بە خۆشویستنی دلّ ئازار دەچیّژی، یاپـارەو سـامانە، ئەگـەر زۆر بـوو، دەبیـت بەگەنجینـەوان و پاسـەوانی..........ئەگەر ئەمـە خۆشیەکانی دونیا بیّت، دەبیّ ناخۆشییەکانی چۆن بیّت.
- هـەولّی ڕۆشـنبیرو بیریـارو پیـاوی تیّگەیشـتوو، گەیشـتنە بۆبەختەوەری، بەهۆی پارە یان زانسـت یابەدەسـەلاّت یابەشـان‌و شکۆ، بەلاّم ئیماندار تائەو ڕۆژەی بەخزمەت خـوای پـەروەردگار دەگات لەهەموویان بەختەوەرترە،
- لەبنچـینەکانی کامـەرانی، نـەبوونی گومـان و ڕق و قینـە و ڕەخنەو دوودلّی و ئارەزووبازی لەدلّی مرۆڤ.
- ئاقلّترین کەس، ئەو کەسەیە، بەباشترین شیّوە، بیانوو بۆ قسە و ڕەفتاری خەلّك بدۆزیتەوە، بەخۆی و خەلّکی دەحەسیّنەوە،
- ﴿فَخُذْ مَا آتَيْتُكَ وَكُن مِّنَ الشَّاكِرِينَ﴾ الاعرف/١٤٤

واتـە: (جـا هەرچـیەکم پێبەخشـیویت بـە تونـدو تـۆلّی بیگـرەو پـــەیڕەوی بکـــەو ڕای بگەیەنـــەو هەمیشـــە و بـــەردەوام لەسوپاسگوزاران بە) (ت: ئاسان)

- ڕازی بە، قەناعـەتت هـەبیّت، بەهـەموو هیّـزو توانـات کاربکـە و



www.iqra.ahlamontada.com

سوودت بۆ دەوروبەرت هەبێت، سوپاسی خوداش بکە،

- بارۆژگارت، سەرتاپای هەر خوێندنەوە، یابیرکردنەوە، یانووسین یا ئەزبەرکردنی وانە نەبێت، بەڵکو لەهەر کارێك، کەمێك، بۆچاڵاکی خۆت ئەو ها باشترە.
- نوێژ کاتەکانت ڕێك دەخا، دەتۆش لەدوای هەر نوێژێك کارێکی بەسوود بکە.
- هەرچی خودا بۆ مرۆڤی داناوە، چاکە، چونکە ئەو باشتر دەزانێ، هەروەها لەدایکی خۆی بەبەزەییترە، کەواتە واباشە بۆبەندە، بەکاری خودا ڕازی بێت، خۆی سپاردەی خودا بکا،
- مرۆڤ بەهۆی بێ توانایی و بێ دەسەڵاتی، نازانێ لەدواتر چ هەیە، تەنیا پێش چاوی خۆی دەبینی، لەدوای ناخۆشی خۆشی دێت،
- باوکە ئادەم (د.خ)، لەدارەکەی خواردو بێ فەرمانی پەروەردگاری کرد، خوداش لە بەهەشت هێنایە خوارەوە، ئێمە بەڕواڵەت وادەزانین، خراپی کرد، بۆیە تووشی کێشەبوو، بەڵام دواتر بووە خێروبەرەکەت، خودا لێی خۆش بوو هەڵیبژاردو کردیە پێغەمبەر، لەپشتی ئەو، پێغەمبەران و زاناو شەهیدو پیاو چاك و خودا پەرست پەیدابوون، پاکی و بێ گەردی بۆئەو خودایەی لەنێوان ئایەتی (أسكن انت وزوجك الجنة، وكلا منها



www.iqra.ahlamontada.com

رغداً)(البقره:٥٣) واته (خۆت و هاوسەرت لەم بەهەشتە دا ژیان بەرنەسەر و نیشتە جێ بن لەهەر کوێ حەزدەکەن، بخۆن و بخۆنەوە بە تێرو تەسەڵی)(ت:ئاسان)

- ﴿ثُمَّ اجْتَبَاهُ رَبُّهُ فَتَابَ عَلَيْهِ وَهَدَى﴾ (طه:٢٢)

واتە : (پاشان پەروەردگاری هەڵی بژاردو – کردی بەپێغەمبەر- تەو بەی لێ وەرگرت و هیدایەت و رێنموویی کرد) (ت : ئاسان)

- یەکەم جار وەکو خەڵك تەنیا خواردن و خواردنەوە و نیشتە جێ بوونە، ئەوانە هیچ هیواو ئاواتێکیان نییە، بەلآم دوای هەڵبژاردنی بە پێغەمبەرو هیدایەت، پلەو پایەکی بەرزو مەزن و شەرەفێکی گەورەی پێ بەخشرا.

- ئەمەش حەزرەتی داود(د.خ)، هەڵەی کرد، دەستبەجێ گریاو تۆبەی کرد، پەشیمان بوویەوە، چونکە بەندەیەکی ملکەچ و گوێ ڕایەڵ بوو، پەروەردگاربەگەورەترین چاکە پاداشتی دایەوە، لەشێخی ئیسلام (ئیبن تەیمیە) یان پرسی، ئەم فەرموودەیە کە پێغەمبەر دەفەرمووێ (عجباً للمؤمن لا یقضی لە شیئاً الاکان خیراً لە) رواه ئەحمەد واتە (سەر سوڕمان بۆمرۆڤی ئیماندار، هەرچی خودای پەروەردگار لە قەزاو قەدەر بۆی نووسیبێ بەو مەرجەی تۆبەو پەشیمانی و ملکەچی لەگەڵ بێت، کەواتە بەڕواڵەت گوناح دانان بۆبەندە خراپ و نەبیستراوە، بەلآم



www.iqra.ahlamontada.com

لەناوەڕۆکدا بیستراوە و باشە،

- هەڵبـژاردن و بڕیـاری خـودای پـەروەردگار بۆچـۆنیەتی ژیـانی پێغەمبـەر، بەباشـی بـۆ ئیسـلام گەڕایـەوە، ئـەو کـوێرەوەری و دەردەسـەرییانەی تووشـی بـوو، بـۆ موسـلمانان سـوودی هـەبوو، بۆنمونە بە درۆخستنەوە و شەڕ لەگەڵ کردنـی گەلەکـەی، بـووە هۆی دانـانی بـازاڕی جیهاد و تێکۆشـان، ئینجا خـودا پشـتیوانی موسـلمانانی کـرد، لـەم شەڕانەشـدا، خـودا پێغەمبـەری بەسـەر خست، شەهیدی لـێ کەوتـەوە کـە میراتگـری بەهەشـتن،، کاتێـك پێغەمبەریان لەشاری مەکە دەرکرد، بەڕواڵەت شتێکی ناڕەوایـە، بـەڵام لەناوەخنیـدا خێـرو خۆشـی یـە، چـونکە بـەو کۆچـەی، دەوڵـەتی ئسـیلام بنیـات نـرا، بـەباوەڕو بـێ بـاوەڕ لەیـەکتری جیاکرانەوە، ڕاستگۆ لەدرۆزن جیاکرایەوە،
- بەدۆڕانــدنی لەشــەڕی (ئوحد)بەڕواڵــەت وادیــارە ناپەســندە، ناخۆشە، بەڵام لە حیکمەتەکانی یەکـەم، موسـڵمانان هەنـدێکیان لە خۆبایی بوونیان بۆپەیدابوو لەشـەڕی بـەدر، باوەڕیـان زیـاد لە پێویستی خۆیان هـەبوو پشـتیان تـەنیا بـە خۆیـان دەبەسـت، لەبـەر ئەمانـە، خـودای پـەروەردگار تـاقی کردنـەوە بـە شـەهید بوونی گەورەی شەهیدان(ئیمـامی هـەمزەی) و بـاڵوێزی ئیسـلام (موسـعەب)و (عەبـدوڵلای کـوڕی عـەمر) بـاوکی جـابیر، ئـەوەی



www.iqra.ahlamontada.com

خودا قسەی بۆکردووە، هەروەها کەسانی تریش،

- لەم شەڕەدا دووڕووەکان ناسران، نهێنیەکانیان ئاشکرابوو، بەم شێوەیە هەرچی بەسەر پێغەمبەر هاتووە، تۆ وابۆی بڕوانە بە ڕواڵەت خراپە بەڵام دواتر بۆ موسڵمانان دەبێتە خێرو خۆشی،
- ئەوەی هەڵبژاردنەکانی خودا بە چاك بزانێ، كارەسات و دەردەسەری و ناخۆشی كاریگەری سووك و ئاسان دەبێت، چاوەڕێی بەزەیی و بەخششی لێ دەكا، نارەزایی دەرنابڕێ، ڕەخنە ناگرێ بۆڵە بۆڵ وورتە ورتی ناكا، سەبر دەگرێ، تاهەوری تەنگو چەڵەمەكە دەڕوا، ئەو كاتە خەم و بێزاری نامێنێت، خۆی سپاردەی خودا دەكا و سوپاسیشی دەكا،
- حەزرەتی نوح (د.خ)، نۆسەدو پەنجا ساڵ لە پێناو بانگەواز ئازار درا، سەبری گرت و سپاردەی خودای دەكرد، بەشەوو ڕۆژ بە نهێنی و ئاشكرا بەردەوام بوو بەبلاوكردنەوەی خواناسی، تا ئەو ڕۆژەی خودا دوژمنەكانی خنكاند و ڕزگاری كرد،
- حەزرەتی ئیبراهیم (د.خ)، خستیانە ناو ئاگر، بەڵام خودای میهرەبان ئاگری ساردو سەلامەت كرد، لەنەمرود ڕزگاری كرد، لەدەست فێڵ و تەڵەكەی میلەتەكەی خۆی دەربازی كردو بەسەری خست، ئایینەكەشی بە نەمری بۆ هەتا هەتایە دەهێڵێتەوە،




www.iqra.ahlamontada.com

- حــەزرەتی موســا (د.خ)، بۆئــازاردانی لەلایــەن فیرعەونــەوە بەردەوام تووشی، ئازارو فێڵ و بۆسـەو ڕاوە دوونـان بـوو، بـەڵام خودای مەزن، بەدار عەسایەکەی فێڵ و جادووی بەتاڵ کـردەوە، دەریای بۆ شەق کرد و پەڕییەوە، سەرەنجام دوژمنانی سەر شۆڕ کرد و خنکاندن،
- حــەزرەتی عیســا (د.خ) لەلایــەن بــەنی ئیســرائیلەوە، دژ بــە ئـابڕووی خـۆی و دایکـی، دژ بـە پەیامـە پیرۆزەکـەی، جـەنگیان لەگەڵ کرد، ویستیان بیکوژن، بـەڵام خـودای باڵا دەست بـۆ لای خۆی بـەرزی کـردەوە، سـەری دەخـاو دووژمنانیشـی پەشـیمان و زەرەر مەند دەبن،
- حــەزرەتی محەمــەد(د.خ) لەلایــەن بــێ بــاوەڕان و جولەکــە و نەسرانیەکان توند ئازار درا، بەدرۆخستنەوە، بەربەرەکانی، بـەر هەڵستی، گاڵتــە، تــوانج، جنێــو، بەشــێت زانــین، بەســیحر بــازو جادووکــار نــاوبردنی، درۆهەڵبەســتن، دەرکــردن، شــەڕلەگەڵ کردنــی، کــوژرانی یــاوەرانی، ئەشــکەنجەدانی هاوەڵــانی، گومــان بردن لەدایکی موسڵمان، حـەزرەتی عائیشـەی خێزانـی، جۆرەها دەردەســەری و لــێ قــەومان و هەڕەشــەو گــەڤ لــێ کــردن، برســی دەکرێــت، ئابلوقــەی لەســەر دادەنرێــت، برینــدار دەکــرێ، ددانــی دەشکێ، لەکاتێکی زۆر پێویست مـامی (ئـەبوتالیب) و حـەزرەتی


www.iqra.ahlamontada.com

(خەدیجـە) ی هاوسـەرو پشـتیوانی دەمـرێ، لەشـەڕی (ئوحـد) دەدۆڕێـنێ (هـەمزە)ی مـامی پـارە پـارە دەکرێـت، چـەندین جـار هـەوڵی تیرۆرکردنـی دەدرێ، لـە بـەر برسـیەتی بـەرد لـە سـکی دەبەستی، هەنـدێ جـار نـانی جـۆ و خورمـای خراپیشـی دەسـت نەدەکەوت، ناخۆشی زۆر چێشت، لەگەڵ هاوەڵانی چەندین جـار تووشی کارەسـاتی جـەرگبڕ بـوون، بـە جۆرێـك دڵیـان دەگەیشـتە دەمیان، مەبەسـتەکانی دەشـێوێندرا، بەسـتەمکار نـاوزەد دەکـرا، بەلووتبـــەرز تاوانبـــار دەکـــرا، عـــارەبی بیابـــان بـــێ ڕێزیـــان بەرامبـەری دەنوانـد، دەوڵەمەنـدان بەرامبـەری لـووت بـەرزییان دەنواند، ڕق و قینـی جوولەکە، فیـڵ و تەڵەکـەی دووڕووان، بـێ پەلەکردنی وەڵامدانەوەی خەڵك بۆبانگەواز، بەڵام سەرکەوتن و سـەرفرازی سـەرەنجام هـەر بۆئـەوە، خـودای مـەزن پشـتی پێغەمبەرەکـەی دەگرێـت، ئایینەکـەی سـەر دەخـا، هـەموو گرووپو تاخم و دوژمنانی، سەر شۆڕو ژێر دەخا، چونکە خـودا فـەرمانی خـۆی جێبـەجێ دەکـا، بـەڵام زۆربـەی خـەڵك ئەمـە نازانن.

- ئەبوبکر لەپێناو ئاینەکەی، تووشی توندو تیژی و دەردەسـەری و ڕێگای سـەخت دەبێـت، مـاڵ و سـامان و پلـەو پایـە و هەرچـی هەیە لـە پێنـاو خـودای پـەروەردگار دەبەخشـێ، ئینجا نازنـاوی



www.iqra.ahlamontada.com

(الصديق) ی پێ بەخشرا،

- عومەری کوڕی خەتاب، دوای ژیانێکی پڕ لەهەوڵ و تێکۆشان و جیهادو قوربانی و دونیا نەویستی و بەرپاکردنی عەدالەت لەسەر زەوی، ئینجا لەمیحراب و لە کاتی نوێژ کوژراو لە خوێنی خۆی گەوزێندرا،
- عوسمانی کوڕی عەففان، لەکاتی قورئان خوێندنەوە شەهید کرا، روحەکەی بووە قوربانی باوەڕو پەیامەکەی،
- عەلی کوڕی ئەبوتالیب، دوای ئەو هەموو هەڵوێستە بەرزانەی لەقوربانی دان و خۆبەخت کردن و دڵسۆزی و ڕاستگۆیی، ئینجا، لەناو مزگەوت، لەکاتی نوێژ تیرۆرو شەهید کرا،
- حوسێنی کوڕی عەلی، بەشمشێری ستەمکاری و ناپاکی شەهید دەکرێت،
- سەعیدی کوڕی جوبەیر زانای خودا ناس، بەدەستی حەجاج شەهید دەکرێت،
- ئیبن زوبەیر، لەناو حەرەم بەدەستی حەجاجی کوڕی یوسف شەهید دەکرێت
- ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، بەند دەکرێت، جەلدەی لێ دەدەن، ئینجا دەبێتە ئیمامی پەیڕەوانی سونەت و جەماعەت،
- واسیقی کوڕی ئیمام ئەحمەدی کوڕی نەسری خوزاعی لەسەر



www.iqra.ahlamontada.com

ڕاست بێژی دەکوژرێت،

- شێخی ئیسلام (ئیبن تەیمیە)، بەندی دەکەن، لەکەسوکاری و هاوڕێ و کتێبەکانی دوور دەخرێتەوە، بەڵام خودای پەروەردگار ناوبانگی بەهەموو دونیا بڵاو کردەوە،
- ئیمام ئەبو حەنیفە لەلایەن ئەبو جەعفەری مەنسوور تووشی جەڵدە لێدان بوو،
- زانای خوداناس سەعیدی کوڕی موسەیب، لەسەر دەستی میری شاری مەدینە، جەڵدەی لێ دەدرێت،
- ئیمام مالیکی کوڕی ئەنەس، کە بەئیمامی شاری مەدینە بەناوبانگە، لەلایەن والی مەدینە تووشی جەڵدە لێدان هات،
- ئەگەر هەربەردەوام لەژماردنی ئەوانەی تووشی دوورخستنەوەو بەند کردن و جەڵدەکراو کوژراوو ئەشکەنجەدراو بم، زۆر درێژەی دەکێشی، ئەوەندەی باسم کردن بەسە.



www.iqra.ahlamontada.com

